بەرنامەی

# پاوەرپۆینت




MICROSOFT OFFICE POWER POINT 2003



Microsoft®
PowerPoint®
2000
MICROSOFT OFFICE

This product is licensed to

Product ID: 50083-009-5484133-02184



ئامادەکردنی
هێمن حەمە عبدالله



١٤٢٧ هەولێر ٢٠٠٦

نـــــاوی کتێـــــب: بەرنامەی پاوەرپۆینت ٣-٢
ئامـــــــادەکردنی: هێمن حەمە عبدان
تـــــایتلی بـــــەرگ: نەوزاد کۆیی
چاپ و بلاوکردنـەوەی: نووسینگەی تەفسیر/ هەولێر
ژمـــارەو ســـالی چـــاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٦
چـــــــــاپکردن: چاپخانەی پەروەردەی هەولێر
تـیـــــــــراژ: ٣٠٠٠ دانە
لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ، ژمارەی سپاردنی
(٣٦) سالی ٢٠٠٦ ی دراوەتێ

پێشەکی :
زانستی کۆمپیوتەر یەکێکە لە زانستە گرنگەکانی ئەمڕۆ ، کەتوانیویەتی بۆشاییەکی گەورە لە هەموو کێشەکان پر بکاتەوە ، هەر لەروی فێرکردن و پەروەردەوە ، بەژداریەکی تەواوی زۆربەی تەکنەلۆژیای سەردەم بکات. لەکوردستانیش ئاورێکی باشی لێ دراوەتەوە ، کەتائێستا توانیویەتی زانستی کۆمپیوتەر بخاتە ریزبەندی بابەتەکانی خوێندن .
دیارە زانستی کۆمپیوتەر تەنیا لەیەك بابەت یان یەك بەرنامە پێك نەهاتوە بەڵکو چەندان بەرنامەی لەخـۆ گرتوە کەهـەر یەکەیان لەبوارێکدا خـزمەت دەکات . یەکـێك لە بەرنامـەکان ، بەرنامـەی (پاوەرپۆینت)ە کەیەکێکە لە بەرنامەکانی کۆمپانیای (Microsoft)ە ، کەتوانیویەتی خزمەتێکی بەرچاو پێشکەش بە بەکارهێنەرانی بکات ، لەروی چاپکردنی نوسینو تایتل و ئامادەکردنی مۆنتاج و بەرنامەو چەندان کاری تر .
هیوادارم توانیبێتم بەم بەرهەمە (موتەوازع)ە خزمەتێکم بە هاوزمانانی خۆم کردبێت و ، خشتێکم لە دیواری کتێبخانەی کوردی دانابێت.

هێمن حەمە عەبدان
Hemin_hama2000@yahoo.com
Hemin_habdan@maktoob.com
موبایل/٠٧٧٠٢٢٨٨٤٥٥
٠٧٣٠١١٦٧١٢٤

## ﴿ چۆنیەتی کار پێکردنی بەرنامەی پاوەرپۆینتی ١٩٩٧ ﴾

پێــشەکی پــاوەرپۆینتی ١٩٩٧ زۆر لــە پــاوەرپۆینتی ٢٠٠٢، یــان ٢٠٠٣ جیاوازە، بەڵام زۆر بەی کارەکانیـان وەك یەکە، واتـە بـۆ هێنـانی وێنـەو لابردنــی و پاراســتنی و ...هتــد. بــەڵام تــەنها جــۆری خولانــەوەیان جیاوازە، جا بۆ یە مـن تـەنها جـۆری خولانـەوەی بـاس دەکـەم، واتـە تـۆ دەتـوانی لـە کارەکـانی تـر هـەمان هـەنگاوەکانی پاوەرپۆینتی ٢٠٠٢، یـان ٢٠٠٣ بە کار بهێنی .

چــۆنیەتی کردنــەوەی بەرنامەکــە، ســەرەتا دەچــینە ســەر لیــستی startلەوێــشەوە دەچــینە ســەر program لەوێــشەوە دەچــینە ســەر بەرنامــەی Microsoft PowerPoint و، کلیکــی چــەپی لــە ســەر دەکەین، لیستێکی ترمان بۆ دەکاتەوە. جا کلیکی چەپ لە بەردەم بەشی Blank presentation بکـە، پاشـان کلیـك لـە سـەر بەشـی okبکـە، لیـستێکی ترمـان بـۆ دەکاتـەوە. تـۆ دەتـوانی بـە ئـارەزووی خـۆت جـۆرە پەڕەیـەك هـەڵ بـژێری، واچاکە پەڕەکـە پەڕەیـەکی سـاف بێـت، پاشـان کلیـك لـە سـەر بەشـی okبکـە، دەبینـی پەڕەکـەت بـۆ جێگـر دەبێـت .

سەرنجی وێنەی خوارەوە بدە .






دوای ئەوەی پەڕەکەمان بۆ کرایەوە، پەڕەیەکی جوان دروست بکە. بۆ نمونە: من ئەم جۆرە پەڕەیەم دروست کردووە وەك پەڕەی من، کە لە ژێرەوە دیارە .




دوای ئەوەی پەڕەکەت دروست کرد، ئنجا بۆ خولاندنـەوەی نوسـینەکەو شتەکانی تر، ئەم هەنگاوانە پەیڕەو بکە. سەرە تا دەچینە سـەر لیستی slide show، کلیکی چەپی لە سەر بکە، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی custom Animation و، کلیکی چەپی لە سەر بکە، شێوەیەکی ترمـان بۆ دەکاتـەوە لـە بەشـی یەکـەم، واتـە بەشـی Timing. ئـەو پـەڕەی، کـە دروسـتت کـردووە لـە چـەند بـەش پێکهاتبێـت، ئەوەنـدە بەشـەی تێـدا دەبێـت. بـۆ نمونـە: ئـەوەی مـن لـە (٦) بـەش پێکهـاتووە، دوای ئـەوەی کلیکـی چـەپت لـە سـەر بەشـی یەکـەم کـرد، ئـەوجا دێینـە سـەر بەشـی یەکـەم، واتـە کلیکـی چـەپ لـە سـەر بەشـی یەکـەم دەکـەین، ئامـادەی

دەکەین. بەڵام نابێت لە ژمارە دوو، یان سێ دەست پێ بکەین. ئەگەر وات کرد نوسینەکە پێش و پاش دەبێت، واتە تێك دەچێت. دوای ئەوەی بەشی یەکەمت دیاری کرد، ئەوجا دێینە سەر بەشێکی تر، واتە بەشی دووەم، بەشی Effects. کلیکی چەپی لە سەر بکە، لەوێشەوە لیستێکت دەداتێ لە بەشی Entry animation and sound، جا کلیکی چەپ بکە، پاشان بە ئارەزووی خۆت جۆرە خولانەوەیەك هەڵ بژێرە، پاشان کلیکی چەپی لە سەر بکە و لە خوار ئەوەیش کلیکی چەپ لە سەر بەشی no sound بکە، کە دەتوانی بە ئارەزووی خۆت جۆرە دەنگێك هەڵ بژێری، کە لە گەڵ نوسینەکە ئەم جۆرە دەنگە دێت. لە خوار ئەویش دەتوانی ڕەنگێك هەڵ بژێری.

پاش ئەوەی بەشی یەکەمت تەواو کرد، ئنجا دەگەڕێیتەوە سەرەتا، ئەوجا بەشی دووەم ئامادە دەکەی، پاشان هەنگاوەکان دووبارە بکەرەوە، بەڵام ئەگەر ئەو بەشەی ویستت بیخولێنیتەوە نوسین بوو، ئەوا لە بەشی دووەم، دوای ئەوەی جۆرە خولانەوەیەکت بۆ هەڵ بژارد، دەتوانی لە بەرامبەر خۆی لە ژێر نوسراوی introduce text کلیکی چەپ بکە، پاشان ئەگەر بتەوێ نوسینەکەت هەمووی بە یەك جار داخڵی ناو شاشەکە بێت، ئەوا بەشی By Letter هەڵ بژێرە. ئەگەر بتەوێ نوسینەکەت وشە وشە بێتە سەر شاشەکە، ئەوا بەشی By Word هەڵ بژێرە، ئەگەر بتەوێ نوسینەکەت پیت پیت بێتە ناو شاشەکە، ئەوا بەشی By Letter هەڵ بژێرە. دوای ئەوەی سەرجەم بەشەکانت تەوا کرد، ئنجا دەتوانی لە هەمان بەش کلیکی چەپ لە سەر بەشی Preview بکەی؛ دەبینی سەرجەم بەشەکانت بۆ دووبارە دەکاتەوە. تۆ

دەتوانی ئەگەر ڕەخنەت لە سەر کارەکەت هەبوو، دوای تەواو بوونی، دەتوانی بەشەکە بەو شێوەیە بگۆڕی، کە خۆت دەتەوێ .

سەیری وێنەی ژێرەوە بکە هەموو بەشەکان روون کراونەتەوە .



## سەرەتا

## چۆنیەتی دابەزاندنی ئۆفیسی ( ٢٠٠٢- ٢٠٠٣ )

### پێشەکیەك لە سەر ئۆفیسی ( ٢٠٠٢ – ٢٠٠٣ )

سەرەتا دەبێت بزانین، کە (windows) ویندۆزی کۆمپیوتەرەکەمان کامە جۆرە، واتە ئەگەر ویندۆزەکەمان جۆری (windows ME ) بوو، ئەوا دەتوانین تەنها ئۆفیسی ( ٢٠٠٢ ) دابەزێنین، واتە ناتوانین ئۆفیسی ( ٢٠٠٣ ) دابەزێنین. بەلأم ئەگەر جۆری ویندۆزەکەمان (windows XP ) بوو، ئەوا دەتوانین هەردوو ئۆفیسی ( ٢٠٠٢ – ٢٠٠٣ ) دابەزێنین. هەروەها بۆ دابەزاندنی ئۆفیسی ( ٢٠٠٢ یان ٢٠٠٣ ) هیچ جیاوازیەکیان نی یە لە کاتی دابەزاندنیان، بۆیە من تەنها یەك جار باسی دابەزاندنی ئۆفیس دەکەم، تەنیا لە کاتی (سریاڵ)دا، ئەویش لە کاتی خۆی باسی دەکەم. هەروەها دەبێت سیدیەکەمان لە بەر دەست بێت، واتە ( ئۆفیس ) جا (٢٠٠٢ ) بێت یان ( ٢٠٠٣ ) .

## چۆنیەتی دابەزاندنی ئۆفیسی ( ٢٠٠٢ – ٢٠٠٣ )

بــۆ دابەزانــدنی ئــۆفیس، ســەرەتا ســیدیەکە دەخەینــە نــاو کۆمپیوتەرەکـەمان، لـە بەشـی سیدی خوێندنەوەکـە، جـا پـاش ئـەوە چاوەرێ دەکەین، تا کۆمپیوتەرەکە سیدیەکەمان بۆ دەخوێنێتەوە، واتـە ڕاستەوخۆ دێتە سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە، واتـە چاوەرێ دەکـەین، تـا کۆمپیوتەرەکــە ئــەو بەشــەی خــوارەوە دێنێتــە ســەر شاشــەی کۆمپیوتەرەکەمان.

ئەگەر بەم ڕێگەیە نەتتوانی ئۆفیسەکە داببـەزێنی، دەتـوانی سوود لـەم ڕێگەیەش وەربگری، ئەویش بەم شێوە:

دەچینە سەر بەشی my computer ، دەبڵ کلیکی چەپی لە سەر بکە ، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی :CD DRIVE F، دەبڵ کلیکی چەپی لـە سەر بکە، پاشان دەچینە سەر بەشی setup، کلیکی ڕاسـتی لەسـەر بکـە، پاشان open هەڵ بژێرە. یان بـە دەبـڵ کلیکی چـەپی لەسـەر بکـە بـۆ دابەزاندنی ئۆفیسەکە .



دوای ئەوەی ئەم شێوەیەت بۆ دەر کەوت، دەتوانی لە خانەی یەکەم، واتە لە بەشی user name ناوی خۆت بنوسی، یان هەر ناوێکی تر. دوای ئەوەی ناوێکت نوسی، ئنجا دێینە سەر بەشی خوارەوە، واتە بەشی سریاڵ، کە لە چەند خانەیەکی بچوك پێك هاتوون، ئەویش بەم شێوەیە: ئەگەر ئەو ئۆفیسەی کە تۆ دایدەبەزێنی ئۆفیسی ( ٢٠٠٢ ) بوو، ئەوا سریاڵەکەی بە شێوەیە دەبێت :

FM9FY – TMF7Q- KCKCT-V9T29-TBBBG

هەروەها بۆ ئۆفیسی ( 2003 ) سریاڵەکەی بەم شێوەیە دەبێت :

GWH28 – DGCMP – P6RC4 – 6J4MT-3HFDY

دوای ئەوەی سریاڵەکەت نوسی، بۆ بەردەوام بون کلیکی چەپ لە سەر بە شی next بکە .



دوای ئەوەی کلیکت لە سەر بەشی next کرد؛ دەبینی شێوەیەکی ترت بۆ دەردەکەوێت، کە دەبینین فرمانی next چالاك نیە. جا بۆ ئەوەی چالاك بێت، دەبێت کلیکی چەپ لە بەر دەم بە شی I accept the terms in License بکەین، کە لە خوارەوە ئاماژەم بۆ کردووە. دوای ئەوەی کلیکی چەپت لە بەر دەم کرد، ئنجا بۆ بەردەوام بوون لە دابەزاندنی ئۆفیس، کلیك لە سەر بەشی Next بکە .



دوای ئەوەی کلیکی چەپت لە سەر next کرد، شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێت، کە کۆمەڵێك بازنەی تێدا هەیە، تۆ کلیکی چەپ لە ناو بازنەی تەنیشت نوسراوی Complete بکە، پاشان دەتوانی بە ئارەزووی خۆت ئۆفیسەکە لە بەشە هاردێك دابنێیت، ئەویش لە ڕێگەی کلیکی لای چەپ کردن لە سەر بەشی Browse، لەوێشەوە بەشە هاردێك هەڵ بژێرە، بەڵام وا باشە هەمیشە ( ئۆفیس و ویندۆز ) لە بەشە هاردی ( C ) دابنێ، واتە هەر دەستکاری مەکە. دوای ئەویش بۆ بەردەوام بوون، کلیکی چەپ لە سەر بەشی Next بکە .

سەیری وێنەی خوارەوە بکە .



دوای ئەوەی ئەم بە شەشمان تەواو کرد، بەشێکی ترمان بۆ دەردەکەوێت< ئەگەر بتەوێ ئۆفیسی پێش خۆی لا بەرێت، ئەوا کلیکی چەپ لە سەر بازنەی سەرەوە، واتە بەشی Remove all previous versions بکە و، لە بەشی خوارەوەش دەتوانی بە ئارەزووی خۆت بەشەکان تەرك بکەی، واتە نەهێڵی هەندێ بەش دابەزێن. ئەویش بە هۆی کلیکی لای چەپ کردن لە بەردەم ئەو بەشەی، کە ناتەوێ دابەزێت. بەڵام وا چاکە هەموویان دابەزن، چونکە ڕۆژێك هەر ئیشت بە هەمان کارەوە دەبێت. پاشان بۆ بەردەوام بوون کلیك لە سەر بەشی Next بکە.



دوای تەواو کردنی ئەم بەشە، ئنجا شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێت، بۆ دواجار دەتوانی کلیکی چەپ لە سەر بەشی install بکەی بۆ دابەزاندنی ئۆفیس، دەبینی ئۆفیسەکە دەست دەکات بە دابەزاندن، تا خەتەکە پردەبێت چاوەڕێ دەکەی. دوای ئەوەی خەتەکە پڕ بوو، دەتوانی بچیتە سەر بەشی start، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی all programs، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Microsoft Office، کلیکی چەپی لە سەر بکە، دەبینی هەموو بە شەکان لەوێ ئامادەن. جا بە کلیك کردن لە سەر هەر بەشێکیان دەبینی بەرنامەکەت بۆ دەکاتەوە.



## چۆنیەتی چونە ناو بەرنامەی پاوەر پۆینت ( POWERPNT )

بۆ چونە ناو بەرنامەی پاوەر پۆینت، دەتوانین چەند ڕێگایەك بگرینە بەر :

### ڕێگای یەكەم /

سەرەتا دەچینە سەر بەشی my computer و، كلیكی ڕاستی لە سەر دەكەین، پاشان open هەڵ دەبژێرین، یان دەبڵ كلیكی چەپی لە سەر دەكەین، ئنجا دەچینە سەر بەشەهاردی C، لە وێشەوە دەچینە سەر program fills، لەوێشەوە دەچینە سەر Microsoft Office و، دەبڵ كلیكی چەپی لە سەر دەكەین، لەوێشەوە دەچینە سەر OFFICE، لە هەنگاوی كۆتایشدا دەچینە سەر بەرنامەی POWERPNT، دەبڵ كلیكی چەپ، یان كلیكی ڕاست پاشان Open دەكەین، دەبینین بەرنامەكەمان بۆ دەكاتەوە .



## چۆنیەتی چونە ناو بەرنامەی پاوەر پۆینت

**ڕێگای دووەم /**

ئەگەر بە ڕێگای یەکەم ئەم کارەت بۆ ئەنجام نەدرا، دەتوانی لە ڕێگای دووەم بە ئاسانتر ئەم کارە ئەنجام بدەی .

سەرەتا دەچینە سەر لیستی start و کلیکی چەپی لە سەردەکەین، پاشان دەچینە سەر بەشی All programs، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Microsoft Office، لەوێشەوە دەچینە سەر بەرنامەی Microsoft Office PowerPoint و، کلیکی چەپی لە سەر دەکەین؛ دەبینین بەرنامەکەمان بۆ دەکاتەوە .



## چۆنیەتی کردنەوەی لا پەڕەیەکی نوێ بۆ بەرنامەکە

### ڕێگای یەکەم /

کردنەوەی پەڕەیەکی نوێ بۆ بەرنامەکە زۆر ئاسانە، ئەویش بەهۆی لیستی standart ەوە دەبێت، لەوێشەوە بەهۆی ئەم هێمایە 🗋 کلیکی چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین چەند پەڕەیەکت لەلای ڕاستی کۆمپیوتەرەکەت بۆ دەردەخات، کە تۆ دەتوانی بە ئارەزووی خۆت یەکێکیان هەڵبژێری، پاشان کلیکی چەپی لە سەر بکەی . بۆ نمونە من پەڕە سافەکەم هەڵ بژاردووە . وەك لە وێنەکە ئاماژەی بۆ کراوە .



تێبینی / ئەگەر هاتوو لیستی standart لە سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەت، نەبوو ئەوا دەتوانین سوود لە لیستی View وەربگرین، جا کلیکی چەپی لە سەر دەکەین و پاشان دەچینە سەر بەشی Toolbars، لەوێشەوە کلیکی چەپ لە بەردەم standart دەکەین، دەبینی لیستەکەت داخڵی سەر شاشەکە دەکات . یان هەر بەشێکی تر .

**رێگای دووەم /**

بۆ کردنەوەی پەڕەیەکی نوێ، دەتوانین بە هۆی کیبۆردەوە ئەم کارە ئەنجام بدەین، ئەویش بە هۆی داگرتنی دوو دوگمەی کیبۆردەکە لە یەك کاتدا، ئەویش هەردوو دووگمەی N + ctrl ، دەبینین لەلای راستی شاشەکە چەند پەڕەیەکت بۆ دەردەخات، کە دەتوانی بە ئارەزووی خۆت یەکێکیان هەڵبژێری و کلیکی چەپی لە سەر بکەی. بەڵام واچاکە جۆری پەڕەکە پەڕەیەکی ساف بێت، پاشان کلیکی چەپی لە سەر بکە، دەبینی کارەکەت بۆ ئەنجام دەدات .



## چۆنیەتی نوسین لە ناو چوارگۆشەیەکدا ( Text Box )

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەتوانین سوود لە لیستی Drawing وەربگرین، لەوێشەوە دەتوانین سوود Text Box وەربگرین ئەویش بە کلیك کردن لە سەر ئەم هێمایە ، پاش ئەوەی کلیکی چەپمان لە سەر کردشێوەی ماوسەکە دەگۆڕێ، ئنجا ماوسەکە دەهێنینە ناو پەڕەکە و، ماوسەکە دەبەیتە ئەو شوێنەی، کە خۆت مەبەستتە نوسینی لێ بنوسی، پاشان کلیکی چەپ دادەگری، بەئارەزووی خۆمان ڕووبەرێکی پێ دیاری دەکەین، بەبێ ئەوەی کلیکی چەپی ماوسەکە بەر بدەین، پاشان کە ڕووبەرەکەت دیاری کرد، کلیکی چەپی ماوسەکە بەردەدەی؛ دەبینی چوارلایەکت بۆ دەکێشێ. دوای ئەوە دەتوانی بە ئارەزووی خۆت جۆری فۆنت و قەبارەی فۆنتەکە دیاری بکەی، پاشان دەست بەو نوسینە بکەی، کە دەتەوێ بینوسی، وەك لە وێنەکەدا دەردەکەوێت .



# چۆنیەتی پاراستنی نوسین

پاش ئەوەی پارچە نوسینێکمان نوسی، پاشان ئەگەر ویستت خەزنی بکەی، ئەوا دەتوانی بەچەند رێگایەکی ئاسان ئەم کارە ئەنجام بدەی :

**رێگای یەکەم /**

سەرەتا دەچینە سەر لیستی Fill، کلیکی چەپی لە سەردەکەین، پاشان دەچینە سەر بەشی Save As و کلیکی چەپی لە سەردەکەین، ئەوا لیستێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە، کە لە بۆشایی تەنیشت File name ناوێك بۆ فایلەکەمان دادەنێین، لەبەرامبەر نوسراوی save in بەشەھاردێك دیاری دەکەین.

بۆ ھەلگرتنی فایل واباشە ھەمیشە فایلەکانت لە بەشەھاردی C دانەنێیت، چونکە بە فۆرمات کردنی کۆمپیوتەر فایلەکانت لەدەست دەچێت، بۆیە ھەمیشە فایلەکانت لە بەشەھاردەکانی تر خەزن بکە.

پاشان کلیکی چەپ لە سەر فرمانی save بکە، بۆ پەشیمان بوونەوەش کلیکی چەپ لە سەر فرمانی cancel بکە .



**ڕێگای دووەم /**

**هەروەها بۆ پاراستنی نوسراوەکە، دەتوانین سوود لە ڕێگایەکی تریش وەربگرین، ئەویش لە لیستی standart، لەوێشەوە دەچینە سەر ئەم هێمایە🖫 save و کلیکی چەپی لە سەردەکەین، لیستێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە، لە بەرامبەر File name ناوێك بۆ فایلەکەمان دادەنێین، لەبەرامبەر save in بەشەهاردێك بۆ هەلگرتنی فایلەکە دیاری دەکەین. پاشان کلیکی چەپ لە سەر فرمانی save بکە، بۆ پەشیمان بوونەوەش کلیکی چەپ لە سەر فرمانی cancel بکە .**



**ڕێگای سێ یەم /**

بەرێگایەکی تریش دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین، ئەویش بەهۆی کیبۆردەوە، بە داگرتنی هەردوو دوگمەی S + ctrl، هەردووکیان پێکەوە دابگرە، دەبینین لیستێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە. بەهەمان شێوە لە بەرامبەر File name ناوێك بۆ فایلەکەمان دادەنێین و، لەبەرامبەر save in بەشەهاردێك بۆ هەلگرتنی فایلەکە دیاری دەکەین. پاشان کلیکی چەپ لە سەر فرمانی save بکە. بۆ پەشیمان بوونەوەش کلیکی چەپ لە سەر فرمانی cancel بکە .

## چۆنیەتی دانانی ژمارەی نهێنی بۆ لا پەڕەکەت

بۆ دانانی ژمارەی نهێنی، واتە password، یەکەم جار دەچینە سەر لیستی tools و، کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، پاشان دەچینە سەر بەشیoptions و، کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت. لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی security و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، پاشان شێوەیەکی تر دەردەکەوێت، لە بۆشایی یەکەم واتە بەرامبەر password to open ژمارەیەك، یان وشەیەك دەنوسین، کە دەمانەوێت ببێتە وشەی نهێنی بۆ کردنەوەی فایلەکە. هەروەها لە بۆشایی دووەم واتە بەرامبەر password to modify هەمان ژمارە یان وشەی یەکەم دەنوسینەوە، واتە نابێت لێك جیاواز بن. پاشان کلیکی چەپ لە سەر ok دەکەین، دەبینین شێوەیەکی تر دەردەکەوێت، بە هەمان شێوە لە بەرامبەر بۆشاییەکە هەمان ژمارە یان وشە بنووسەوە، کە دەبێتە وشەی نهێنی، پاشان کلیك لە سەر ok بکە، لەدوای ئەویش وەك جارەکانی پێشوو شێوەیەکی ترت بۆ دەردەکەوێت. ژمارە یان وشەکە لە ناو بۆ شاییەکە بنووسەوە و کلیکی چەپ لە سەر ok بکە، دەبینی کارەکەت بەسەر کەوتویی کۆتایی پێدێت. پاشان فایلەکەت بە ناوێك خەزن بکە و کلیك لە سەر save بکە .



# چۆنیەتی کردنەوەی فایلی خەزن کراو

بۆ کردنەوەی هەر فایلێکی ناو کۆمپیوتەرەکەت دەتوانین بە چەند ڕێگەیەك ئەم کارە ئەنجام بدەین :

ڕێگای یەکەم :

سەرەتا دەچینە سەر لیستی file، لە وێشەوە دەچینە سەر بەشیOpen و، کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینی شێوەیەکت بۆ دەردەکەوێت، کە دەتوانی بە ئارەزووی خۆت هەر فایلێکت لە ناو کۆمپیوتەرەکەت هەیە دیاری بکەیت. بەڵام دەبێت بزانی ئەو فایلەی، کە دەتەوێ بیکەیتەوە، لە کام بەشە هاردی کۆمپیوتەرەکەتە. پاش ئەوەی ئەمانەت دیاری کرد، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر فایلەکە دەکەی، پاشان کلیکی چەپ لەسەر Open دەکەی، یان بەدەبڵ کلیکی چەپ لە سەر فایلەکە دەکەی، دەبینی فایلەکەت بۆ دەکاتەوە .



## ڕێگای دووەم :

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەتوانین سود لە ڕێگایەکی تریش وەر بگرین، ئەویش بەهۆی open. واتە ئەم هێمایە 🗁 کە لەسەر شاشەکە دیارە، دەتوانی کلیکی چەپی لە سەر بکەی، شێوەیەکت بۆ دەردەکەوێت، دەتوانی بە هەمان ڕێگای یەکەم، هەر فایلێك لە ناو کۆمپیوتەرەکەت هەیە دیاری بکەیت، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر فایلەکە دەکەی، پاشان کلیکی چەپ لەسەر Open دەکەی، یان دەبڵ کلیکی چەپ لە سەر فایلەکە دەکەی، ئەوسا فایلەکەت بۆ دەکاتەوە .



**ریگای سێ یەم :**

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەتوانین سوود لە کیبۆردیش وەربگرین، ئەویش بە هۆی داگرتنی هەردوو دوگمەی O + ctrl لە یەك کاتدا، جا دەبینی شێوەیەکت بۆ دەردەکەوێ، کە دەتوانی بە ئارەزووی خۆت هەر فایلێکت هەیە لە ناو کۆمپیوتەرەکەت بیکەیتەوە، پاش ئەوەی فایلەکەت دیاری کرد، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر فایلەکە دەکەی، پاشان کلیکی چەپ لەسەر Open دەکەی، یان دەبڵ کلیکی چەپ لە سەر فایلەکە دەکەیت، دەبینی فایلەکەت بۆ دەکاتەوە .



## چۆنیەتی داخستنی بەرنامەکە

پاش ئەوەی کارمان بە بەرنامەکە نەما، ئەوا دەتوانین لە بەرنامەکە دەربچین، ئەویش بە چەند ڕێگایەك :

**ڕێگای یەکەم :**

بە هۆی ئەم هێمایە × کە لە سوچی بەرنامەکە هەیە، دەتوانیت کلیکی چەپی لە سەر بکەیت، تا بەشی یەکەم دابخرێت. بۆ داخستنی بەشی دووەمیش، لە سەر هەمان هێمای سەرەوەتر کلیك دەکەی، تا بە یەکجاری لە بەرنامەکە دەربچیت، ئەویش بە هۆی کلیکی چەپ . وەك لە وێنەکە دیارە .



## ڕێگای دووەم :

هەروەها دەکرێ بە ڕێگایەکی تریش ئەم کارە ئەنجام بدەین، ئەویش لە ڕێگەی کلیك کردن لەسەر لیستی File، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Exit و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین ڕاستەوخۆ بەرنامەکە بەتەواوی دادەخرێت، وەك لە وێنەکە ئاماژەی بۆ کراوە .



**ڕێگای سێ یەم :**

هەروەها دەگرێ بۆ داخستنی بەرنامەکە، سوود لە کیبۆردیش وەر بگرین، ئەویش بەهۆی داگرتنی هەردوو دوگمەی W + ctrl، ئەمەیان تەنها بۆ داخستنی پەڕەکە دەبێت. بەڵام بۆ داخستنی بەرنامەکە، دەتوانی بەهۆی هەردوو دوگمەی F4 + Alt بە یەك جاری لە بەرنامەکە دەربچیت .

ئەگەر بتەوێ بە یەکجار بچیتە دەرەوەی بەرنامەکە، ئەوا تەنها بەشی دووەم ئەنجام بدە، واتە تەنها F4+ Alt دابگرە بۆ داخستنی بەرنامەکە، وەك لە وێنەکە ئاماژەیان بۆ کراوە .



## چۆنیەتی هێنانی شێوەیەکی جوا ن بۆ ناو پەڕەکە

بۆ هێنانی شێوەیەکی جوان بۆ ناو پەڕەکەمان، دەکرێ لە لیستی Drawing سوود لەم هێمایە ☐ وەربگرین، کلیکی چەپی لە سەر دەکەین، پاشان دەچینە ناو پەڕەکە و کلیکی چەپ لەسەر گۆشەی پەڕەکە دادەگرین، کلیکەکە ڕادەکێشین بەبێ ئەوەی بەری بدەین، تا هەموو پەڕەکەی پێ دەگرین، ئەوجا کلیکی چەپ بەر دەدەین، دەبینی شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەچێت .

**تێبینی/** دوای ئەنجام دانی ئەم کارە، کۆمپیوتەرەکەت بۆ خۆی ڕەنگێك دیاری دەکات، کە دەتوانی ڕەنگەکە بگۆڕی، هەروەك لە هەنگاوەکانی داهاتوو باسی دەکەین .



# چۆنیەتی گۆڕینی ڕەنگی ناو پەڕەکە

بۆ گۆڕینی ڕەنگی ناو پەڕەکە، دەتوانین بە ئاسانی ئەم کارە ئەنجام بدەین. سەرەتا پەڕەکە ئامادە دەکەین، واتە کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، جا لەوێشەوە دەتوانی سوود لەم هێمایە وەربگریت، کە لە سەر لیستی Drawing ئاماژەم بۆ کردووە، تۆ دەتوانی کلیکی چەپی لەسەر بکەی، لیستێکمان بۆ دەردەچێت. ئەگەر بتەوێ ڕەنگێکی بۆ هەڵبژێری، ئەوا ئەم هەنگاوانە پەیڕەو بکە، سەرەتا کلیکی چەپی لە سەر بکە، پاشان کلیکی چەپ لە سەر more fill colors بکە، لیستێکی ڕەنگت بۆ دەردەکەوێت، لەوێشەوە کلیکی چەپ لە سەر بەشی standard بکە، ئەوکات تۆ دەتوانی بە ئارەزووی خۆت ڕەنگێك دیاری بکەی. پاشان دەتوانی ڕێژەی تۆخ و ناتۆخی ڕەنگەکە دەستکاری بکەی، بەهۆی Transparency، کە دەتوانی ڕێژەکە لە سفرەوە بگۆڕی بۆ ئەو پلەیەی کەخۆت دەتەوێ. وەك لە وێنەکە ئاماژەی تەواوی بۆ کراوە.



# چۆنیەتی هێنانی ڕەنگی جوانتر بۆ ناو پەڕەکە

بۆ هێنانی ڕەنگی جوان، یان وێنە بۆ ناو پەڕەکە، دەتوانین هەر لە بەشی Drawing سوود وەربگرین، ئەویش بە کلیکی چەپ کردن لەسەر ئەم هێمایە دوای کلیکی چەپت لە سەرکرد، لیستی fill Effects هەڵبژێرە، لیستێکی ترت بۆ دەدەکەوێت، لەم بەشە چەند بەشێکی جوانی تێدایە .

**بەشی یەکەم /یەکەم/** بە کلیك کردن لە سەر Gradient شێوەیەکت بۆ دەردەکەوێت، کە بە کلیك کردن لەسەر بازنەی بەدەم one color چالاك دەبێت، دەتوانی کلیکی چەپ لە سەر color 1 بکەی، لەوێشەوە بەشی کلیکی چەپ لەسەر colors more بکە، پاشان بە ئارەزووی خۆت ڕەنگێك هەڵبژێرە، ئنجا ok بکە. هەروەها لە ژێرەوەش دەتوانی ڕێژەی ڕەنگەکە کەم و زیاد بکەی، وەك لە وێنەکە دیارە .



**دووەم :** Two colors

لەم بەشەدا کلیك لەسەر بازنەی بەردەم Two colors دەکەین، تا چالاك بێت، دوای ئەوەی چالاك بوو، دەتوانی کلیکی چەپ لە سەر color1 بکەی، لەوێش کلیکی چەپ لە سەر بەشی more colors بکە، ئنجا بە ئارەزووی خۆت ڕەنگێك هەڵبژێرە و، کلیك لەسەر ok بکە. لە خوارەوەش دەتوانی کلیکی چەپ لەسەر color2 بکەی، لەوێش کلیکی چەپ لەسەر بەشی more colors بکە، ئنجا بە ئارەزووی خۆت ڕەنگێك هەڵبژێرە، بەڵام با ڕەنگی دووەم لە هی یەکەم جیاواز بێت، بۆ ئەوەی کارەکەت جوان بێت. لە خوارەوەش دەتوانی ڕێژەی کەم و زۆری ڕەنگەکە دەستکاری بکەی. جا بە کلیك کردن لە سەر هەر بازنەیەك لە خوارەوە، دەبینی شێوەی ڕیزبوونی ڕەنگەکە دەگۆڕی، تۆ دەتوانی لە ناو چوارگۆشەکە یەکێکیان دیاری بکەی و کلیك لەسەر ok بکەیت، لەوێشەوە بۆ هەنگاوی دوای کلیکی چەپ لەسەر ok بکە، بۆ ئەوەی کارەکەت داخڵی ناو پەڕەکە بکات .



**سێ یەم :**

ئەمیش بەهەمان شێوەکانی تر، بە کلیك کردن لەو بازنەی بەردەمی preset چالاك دەبێت، دەچیتە خوار نوسراوی preset colors، کلیکی چەپ لە سەر سێگۆشەی تەنیشتی دەکەی، لیستێکت بۆ دەکرێتەوە، بە ئارەزووی خۆت کلیکی چەپ لە سەر یەکێکیان بکە، دەبینی شێوە ڕەنگێکت نیشان دەدات، کە ئامادە کراون، لە خوارەوەش دەتوانی ڕێژەی کەم و زۆری ڕەنگەکە دەستکاری بکەی، بە کلیك کردن لە سەر هەر بازنەیەك لە خوارەوە، شێوەی ڕیز بوونی ڕەنگەکە دەگۆڕێ، تۆ دەتوانی لە ناو چوارگۆشەکان یەکێکیان دیاری بکەی، پاشان بۆ هەنگاوی دوایی کلیکی چەپ لە سەر ok بکە، تا کارەکەت داخڵی ناو پەڕەکە بکات . وەك لە وێنەك ەدا ئاماژەی بۆ کراوە.



**بەشی دووەم :**

لە لیستەی fill Effects دا بەشێکی تریشمان هەیە، کە چەند نەخشێکی ئامادەکراوی جوانی تێدایە. دوای کردنەوەی fill Effects و، کلیکی چەپت لە سەر Texture کرد؛ شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێت، کە کۆمەڵێك نەخشی تێدایە، دەتوانی بە ئارەزووی خۆت یەکێکیان دەست نیشان بکەی، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر ok بکە؛ دەبینی نەخشەکەت داخڵی ناو پەڕەکە دەکات.

هەروەها لە ژێر نەخشەکانیش نوسراوی other Texture هەیە، ئەگەر کلیکی چەپی لە سەر بکەی، دەتوانی هەر وێنەیەك لە ناو کۆمپیوتەرەکەتدا هەبێت، لەم ڕێگایەوە بیهێنی بۆ ناو پەڕەکەت، بەڵام دەبێ بزانی وێنەکە لە کام بەشە هاردی کۆمپیوتەرەکەتە. دوای دیاریکردنی وێنەکە، کلیك لە سەر Open بکە، ئنجا بۆ ئەوەی کارەکەت داخڵی ناو پەڕەکە بکات، کلیك لە سەر ok بکە .



## بەشی سێیەم pattern

هەر لەم بەشەی کە کردومانەتەوە، بەشێکی ترمان هەیە، جا بۆ کردنەوەی ئەم بەشە، بە هەمان شێوە دەچینە سەر هەمان هێما لە لیستی Drawing دا و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی fill Effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ شێوەیەکمان بۆ دەردەکەوێت. لەو شێوەیەدا کلیکی چەپ لەسەرpattern دەکەین، شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێت، کە کۆمەڵێك نەخشی تێدایە، دەتوانی نەخشێکی جوان هەڵبژێری. بۆ دیاریکردنی ڕەنگەکانیشی، سەرەتا کلیکی چەپ لەسەر foreground بکە، لەوێشەوە کلیکی چەپ لە سەر more color بکە، لەوێ بە ئارەزووی خۆت ڕەنگێك دیاری بکە، پاشان کلیك لەسەر ok بکە. ئنجا بەهەمان شێوە کلیکی چەپ لە سەر Background بکە و، بەشی more color هەڵبژێرە، لەوێش بە ئارەزووی خۆت ڕەنگێك هەڵبژێرە، بەڵام با لە ڕەنگی یەکەم جیاواز بێت، بۆ ئەوەی کارەکەت جوان بێت، ئنجا کلیك لەسەر ok بکە، دەبینی ڕەنگی نەخشەکان گۆڕاون، جارێکی تریش کلیك لەسەر ok بکە، تا کارەکەت داخڵی ناو پەڕەکە بێت .




بۆ پیشاندانی نەخشەکە لە ناو پەڕەکە

## بەشی چوارەم و کۆتایی picture

هەر لەم بەشەی کە کردومانەتەوە بەشێکی ترمان هەیە بەناوی picture، لەم ڕێگایەوە دەتوانین وێنەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەمان بهێنین بۆ ناو پەڕەکەمان.

بۆ کردنەوەی ئەم بەشەش بە هەمان شێوە دەچینە سەر هەمان هێما لە لیستی Drawing و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی picture و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین، ئنجا دەچینە سەر بەشی select picture و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، جا دەچینە سەر ئەو بەشە هاردەی وێنەکانی تێدایە، بۆ نمونە وێنەکانی من لە هاردی E دایە، بۆیە دەبێت سەرەتا کلیکی چەپ لە سەر سێگۆشەی بەرامبەر بۆشایی Look in بکەم، ئنجا بچم بۆ بەشە هاردی E و کلیکی چەپی لە سەر بکەم، ئنجا دەچمە سەر بەشی وێنەکان، لەوێ بە ئارەزووی خۆم وێنەیەك هەڵدەبژێرم، ئنجا کلیك لە سەر insert دەکەم، پاشان کلیك لەسەر ok دەکەم، بۆ ئەوەی وێنەکە داخڵی ناو پەڕەکە بکات .



# چۆنیەتی نوسین لەسەر وێنەکە

بۆ نوسین لە سەر وێنەکە، یان لەسەر شتێکی تر، دەکرێ بە شێوەیەکی ئاسان ئەم کارە ئەنجام بدەین.

سەرەتا دەچینە سەر لیستی drawing و، لەوێشەوە دەچینە سەر ئەم هێمایە واتە textbox، کلیکی چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەی ماوسەکە دەگۆڕێ، ئنجا دەچینە ئەو شوێنەی کە دەتەوێ لە سەری بنوسی، لەوێ کلیکی چەپ دابگرە و، بێ ئەوەی بەری بدەی رایبکێشە تا ئامانجەکەت دیاری دەکەی، ئنجا کلیکی چەپ بەر بدە؛ دەبینی شوێنێك دیاری دەکات، ئەوجا جۆر و قەبارەی فۆنتەکە دیاری بکە، ئەوجا دەست بە نوسینەکەت بکە.

## چۆنیەتی هێنانی چوارگۆشەیەکی جوان بۆ دەوری نوسینەکە

ئەم کارە بەهۆی Auto shapes ئەنجام دەدرێت:

سەرەتا کلیکی چەپ لە سەر Auto shapes بکە، ئنجا بە ئارەزووی خۆت لە بەشەکان یەکێکیان هەڵبژێرە، بۆ نمونە من ئەمەیانم هەڵبژاردووە ، پاش ئەوەی کلیکی چەپت لەسەر کرد، شێوەی ماوسەکە دەگۆڕێ، ئنجا کلیکی چەپی ماوسەکە لە کۆتایی ئەو نوسینە دابگرە، کە دەتەوێ بیخەیتە ناو چوارچێوە، ڕایبکێشە بەبێ ئەوەی بەری بدەی، تا چوارچێوەکە نوسینەکەت دادەپۆشێ، ئەوجا کلیکی چەپ بەربدە؛ دەبینی نوسینەکە دیار نامێنێت، جا بۆ دەرخستنەوەی دەتوانین سوود لە Draw وەربگرین؛ ئەویش سەرەتا کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەکە بکە، واتە ئامادەی بکە، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر Drawبکە، لەوێشەوە بچۆ بۆ بەشی order، لەوێشەوە بچۆ بۆ بەشی send Backward و کلیکی چەپی لەسەر بکە؛ دەبینی نوسینەکەت بۆ بەدیار دەخاتەوە. بۆ نوسینی گەورەش، هەمان ڕێگا پەیڕەو بکە بۆ دانانی چوارچێوە .



## چۆنیەتی گۆڕینی ڕەنگی ناو چوارچێوەکە

بۆ گۆڕینی ڕەنگی ناو چوارچێوەکە، سەرەتا یەك کلیکی چەپ لەسەر بازنەکە، یان چوارچێوەکە دەکەین تا ئامادە بێت، دەبێ تەنیا بازنەکە دیاری بکەی، نابێت نوسینەکەی لەگەڵ دابێت. دوای ئەوەی ئامادەت کرد، دەچینە سەر ئەم هێمایە و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی fill effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەکاتەوە:

بەشی یەکەم Gradient: لە one color دەتوانی ڕەنگێك دیاری بکەی، لە Tow colors دەتوانی دوو ڕەنگ لێك بدەی و شێوەیەکی جوان دروست بکەی، هەروا لە preset دەتوانی سوود لە چەند ڕەنگێکی ئامادەکراو وەربگری.

بەشی دووەم Texture: دەتوانی بە ئارەزووی خۆت نەخشێك دیاری بکەی، پاشان ok بکەیت.

بەشی سێیەم pattern: دەتوانی دوو ڕەنگ هەڵبژێری و، لە ناو چوارچێوەکە بەشێکیان هەڵبژێری.

بەشی چوارەم picture: دەتوانی سوود لە وێنەکانی ناو کۆمپیوتەرەکە وەر بگری .



# چۆنیەتی گۆڕینی ڕەنگی ڕۆخەکانی چوارچێوەکە

بۆ گەورەکردنی قەبارەی خەتی دەوری چوارچێوەکە، دەتوانی سوود لەم هێمایە وەربگریت ▬ لە لیستی Drawingدا، کلیکی چەپی لە سەر بکە، پاشان بە ئارەزووی خۆت جۆرە خەتێك هەڵبژێرەو کلیکی چەپی لەسەر بکە، دەبینین چوارچێوەکە وەری دەگرێت.

بۆ گۆڕینی ڕەنگی ڕۆخەکانی چوارچێوەکە، دەتوانین لە هەمان لیست و بە هۆی ئەم هێمایە کارەکەمان ئەنجام بدەین؛ سەرەتا کلیکی چەپ لە سەر چوارچێوەکە بکە، واتە ئامادەی بکە، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر هێمایەکە بکە، ئنجا ئەگەر بتەوێ ڕەنگێکی بۆ دابنێی؛ ئەوا کلیکی چەپ لە سەر بەشی more line colors بکە، ئنجا بە ئارەزووی خۆت ڕەنگێك هەڵبژێرە، پاشان ok بکە.

ئەگەر بتەوێ نەخشێك هەڵبژێری، ئەوا کلیکی چەپ لە سەر هێمایەکە بکە، پاشان کلیکی چەپ لە سەر بەشی patterned Lines بکە، لەوێشەوە بۆ هەردوو بۆشاییەکان هەریەکەو ڕەنگێکیان بۆ هەڵبژێرە، ئنجا لەناو چوارچێوەکە یەکێکیان دیاری بکە و ok لەسەر بکە.

هەروەها دەتوانی خەتی چوارچێوەکە بگۆڕی بۆ خاڵ خاڵ، یان هەر بەشێکی تر، ئەویش بەهۆی سود وەرگرتن لەم هێمایە ، کلیکی چەپی لەسەر بکە، پاشان بە ئارەزووی خۆت یەکێکیان بۆ دەوری چوارچێوەکە هەڵبژێرە.









# چۆنیەتی لابردنی ڕەنگ لە ناو چوارچێوەکە

ئەگەر بتەوێ هیچ ڕەنگێك بۆ ناو چوارچێوەکە دانەنێیت، ئەوا سەرەتا کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەکە بکە، واتە ئامادەی بکە، ئنجا بچۆ سەر لیستی drawing، لەوێشەوە سوود لەهەمان هێما وەربگرە و کلیکی چەپی لەسەر بکە، ئنجا بچۆ بۆ بەشی no fill و کلیکی چەپی لەسەر بکە، دەبینی هیچ ڕەنگێك لە ناو چوارچێوەکەدا نامێنێت.

جا بۆ ئەوەی چواردەوری چوارچێوەکەش هیچ ڕەنگێکی نەبێت، کلیکی چەپ لە سەر ئەم هێمایە بکە، ئنجا بچۆ بۆ بەشی no fill و کلیکی چەپی لەسەر بکە، دەبینی هیچ ڕەنگێك لە دەوری چوارچێوەکە نامێنێت .



## ئەگەر لیستی drawing لە سەر شاشە نەبوو دەتوانی چ بکەی ؟

ئەگەر هاتوو لە لیستی drawing کارەکانت بۆ ئەنجام نەدرا، دەتوانی لە ڕێگەیەکی تر کارەکانت ئەنجام بدەی، دەتوانی سوود لە لیستی format وەربگریت. سەرەتا کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەکە بکە، واتە ئامادەی بکە، ئنجا بچۆ سەر لیستی format و کلیکی چەپی لەسەر بکە، ئنجا بچۆ بۆ بەشی Auto shapes و کلیکی چەپی لەسەر بکە؛ لیستێکی ترت بۆ دەردەکەوێت. لە بەشی یەکەم fill و، لەبەرامبەر colorیش دەتوانی ڕەنگێك، یان نەخشێك، یان وێنەیەك دیاری بکەی، کە ئەمەیان بۆ ناو چوارچێوەکەیە، لە خوارەوەش دەتوانی ڕێژەکەی کەم و زۆر بکەی. لە بەشی دووەم Line و، لە بەرامبەرcolor، دەتوانی ڕەنگێك، یان نەخشێك دیاری بکەی، ئەمەیان بۆ چواردەوری چوارچێوەکەیە، لەبەرامبەر نوسراوی style دەتوانی خەتێك بۆ چواردەوری چوارچێوەکە هەڵبژێری. لە بەرامبەر نوسراوی Dashed دەتوانی جۆری خەتەکە بگۆڕی بۆ خاڵ خاڵ، یان هەر بەشێکی تر، لە بەرامبەر نوسراوی weight دەتوانی قەبارەی خەتەکە کەم و زۆر بکەی، دوای ئەوەی ئەمانەت دیاری کرد، بۆ ئەوەی کارەکەت داخڵی ناو پەڕەکە بکات، کلیك لە سەر ok بکە .



## ئەگەر لیستی drawing لە سەر شاشەکەت نەبوو چۆن دەیهێنیتەوە؟

ئەگەر هاتوو لیستی drawing، یان هەر لیستێکی تر لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەت نەبوو، ئەوا ئەم هەنگاوانە پەیڕەو بکە:
سەرەتا بچۆ سەر لیستی view و کلیکی چەپی لەسەر بکە، ئنجا بچۆ بۆ بەشی toll bares، لەوێش کلیکی چەپ لە سەر ئەو لیستە بکە، کە وون بووە. بۆ نمونە: ئەگەر لیستی drawing وون بووبێ، کلیکی چەپ لە بەردەم نوسراوی drawing بکە، دەبینی لیستەکەت بۆ دەخاتە سەر شاشەکە .



# گەڕانەوە و دووبارە دانانەوەی نوسین

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەتوانین سوود لە چەند ڕێگایەك وەربگرین:

**ڕێگای یەکەم :**

بۆ ئەنجام دانی کاری گەڕانەوە بۆ دواوە، دەتوانین سوود لە لیستی Edit وەربگرین، کلیکی چەپی لەسەر بکە، ئنجا دەچینە سەر بەشی undo font و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینی کاری گەڕانەوەمان بۆ دواوە بۆ ئەنجام دەدات.

هەروەها بۆ دووبارە دانانەوەی نوسینەکە، یان هەر شتێکی تر، دەتوانین لە هەمان لیست، واتە لیستی Edit سوود وەربگرین، کلیکی چەپی لەسەر بکە، ئنجا بچۆ بۆ بەشی Repeat format object و کلیکی چەپی لە سەر بکە، دەبینی دووبارە نوسینەکەمان بە سەرکەوتوویی بۆ دادەنێتەوە.



## ڕێگای دووەم :

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەتوانین سوود لەم دوو هێمایانەش وەربگرین، کە لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەمان هەیە. ، هێمای یەکەم، واتە ئەم هێمایە. undo font کارەکەمان بۆ دەگەڕێنێتەوە بۆ دواوە، واتە هەنگاوێکمان بۆ دەگەڕێنێتەوە، هێمای دووەم، واتە ئەم هێمایە. Repeat format object، کلیکی چەپی لەسەر بکەی، دەبینی دووبارە نوسینەکەمان بە سەرکەوتوویی بۆ دادەنێتەوە.



ڕێگای سێ یەم :

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، دەتوانین بە ڕێگایەکی تریش کارەکەمان جێبەجێ بکەین، ئەویش بە سوود وەرگرتن لە کیبۆرد.

بۆ کاری گەڕانەوەی نوسینەکەمان، یان هەر شتێکی تر، دەتوانین بە هۆی داگرتنی هەردوو دوگمەی Z+ctrl ئەم کارە ئەنجام بدەین.

بۆ کاری دووبارە دانانەوەش، دەتوانین هەر بەهۆی کیبۆردەوە ئەویش جێبەجێ بکەین، ئەویش بەهۆی داگرتنی هەردوو دووگمەیctrl + Y ئەم کارەشمان بە سەرکەوتووی بۆ ئەنجام دەدات .



## چۆنیەتی بڕینی نووسین

ئەم کارە  بە چەند رێگایەك ئەنجام دەدرێت:

**رێگای یەکەم /**

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، دەکرێ سوود لەم هێمایە ✂ وەربگرین. سەرەتا ئەو بەشە نوسینە ئامادە بکە، کە دەتەوێ بیبڕی، کلیکی چەپی ماوسەکە لە کۆتایی نوسینەکە دابگرە و بەبێ ئەوەی بەری بدەی تا کۆتایی نوسینەکە ڕایکبێشە، تا نوسینەکە ئامادە دەکەی، پاشان دەست هەلگرە. دوای ئامادەکردنی نوسینەکە، ئنجا بچۆ سەر لیستی Edit و کلیکی چەپی لەسەر بکە، پاشان بچۆ بۆ بەشی cut و کلیکی چەپی لەسەر بکە، دەبینی کارەکەت بۆ ئەنجام دەدات .



**ڕێگای دووەم :**

**بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەکرێ سوود لەم هێمایە ✂ وەربگرین ، کە لە سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەمان هەیە . سەرەتا ئەو بەشە نوسینەی کە دەتەوێ بیبڕی ئامادەی بکە ، کلیکی چەپی ماوسەکە لە کۆتایی نوسینەکە دابگرەو ڕایبکێشە بەبێ ئەوەی دەستت هەڵبگری ، تا نوسینەکە ئامادە دەکەی ، ئنجا دەستت هەلگرە ، جا دوای ئەوەی نوسینەکەت ئامادەکرد، ئنجا بچۆ بۆ سەر ئەم هێمایە ✂ و کلیکی چەپی لە سەر بکە ، دەبینی نوسینەکەت بۆ دەبڕێت .**



ڕێگای سێ یەم :

هەروەها بۆ ئەنجام دانی کاری بڕین ، دەکرێ سوود لە کیبۆردیش وەربگرین . بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە سەرەتا ئەو بەشە نوسینەی کە دەتەوێ بیبڕی ئامادەی بکە ، کلیکی چەپی ماوسەکە لە کۆتایی نوسینەکە دابگرەو ڕایبکێشە بەبێ ئەوەی دەستت هەڵبگری ، تا نوسینەکە ئامادە دەکەی ، ئنجا دەستت هەلگرە ، جا دوای ئەوەی نوسینەکەت ئامادەکرد ، ئنجا بچۆ بۆ سەر کیبۆردەکەت ، لەوێشەوە بەهۆی داگرتنی هەردوو دوگمەی ctrl +X کارەکەمان بۆ ئەنجام دەدات.



# چۆنیەتی لە بەرگرتنەوەی نوسین

بە چەند ڕێگایەك دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین :

**ڕێگای یەکەم :**

بۆ ئەنجام دانی کارەکەمان ، سەرەتا ئەو بەشە نوسینەی کە دەتەوێ بیبڕی دیاری بکە ، کلیکی چەپی ماوسەکە لە کۆتایی نوسینەکە دابگرە و ڕایبکێشە بەبێ ئەوەی دەستت هەڵبگری ، تا نوسینەکە دیاری دەکەی، ئنجا دەستت هەلگرە ، جا دوای ئەوەی نوسینەکەت دیاری کرد، ئنجا دەچینە سەر لیستیEdit کلیکی چەپی لە سەر دەکەین ، ئنجا دەچینە سەر بەشی copy و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین ، دەبینین کارەکەمان بۆ جێبەجێ دەکات.

هەروەها دەتوانی، دوای ئەوەی نوسینەکەت دیاری کرد ، کلیکی راست لەسەر نوسراوەکە بکەی ، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر نوسراویcopy بکەی .



**ڕێگای دووەم /**

بە ڕێگایەکی تریش دەکرێ ئەم کارە ئەنجام بدەین ، ئەویش بە هۆی ئەم هێمایە :

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، دەکرێ سوود لەم هێمایە وەربگرین ، کە لە سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەمان هەیە. سەرەتا ئەو بەشە نوسینەی کە دەتەوێ بیبڕی دیاری بکە ، کلیکی چەپی ماوسەکە لە کۆتایی نوسینەکە دابگرە و ڕایبکێشە بەبێ ئەوەی دەستت هەڵبگری ، تا نوسینەکە دیاری دەکەی، ئنجا دەستت هەلگرە ، جا دوای ئەوەی نوسینەکەت دیاری کرد، ئنجا بچۆ بۆ سەر ئەم هێمایە و کلیکی چەپی لە سەر بکە ، دەبینی نوسینەکەت بۆ copy دەکات .



**ڕێگای سێ یەم :**

بۆ ئـەنجام دانـی کـاری لـە بەرگرتنـەوە ، دەکـرێ سـوود لـە کیبـۆردیش وەربگرین . سەرەتا ئەو بەشە نوسینەی کە دەتەوێ بیبڕی دیاری بکە ، کلیکی چەپی ماوسەکە لە کۆتـایی نوسینەکە دابگرە و ڕایبکێشە بـەبێ ئـەوەی دەسـتت هـەڵبگری ، تـا نوسینەکە دیـاری دەکـەی، ئنجـا دەسـتت هەلگرە ، جا دوای ئـەوەی نوسـینەکەت دیـاری کـرد، ئنجـا بـچۆ بـۆ سـەر کیبۆردەکـەت ، لەوێـشەوە بـە داگرتنـی هـەردوو دوگمـەی ctrl +C کارەکەمان بۆ ئەنجام دەدات .



## چۆنیەتی دانانەوەی نوسین

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە ، دەکرێ بە چەند ڕێگایەك کارەکەمان ئەنجام بدەین :

**ڕێگای یەکەم :**

بۆ ئەنجام دانی کارەکەمان ، سەرەتا ئەو شوێنە دیاری دەکەین ، کە دەمانەوێت نوسینەکەی لێ دابنێین ، دوای دیاری کردنی شوێنی نوسینەکە ، دەچینە سەر لیستی Edit و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Paste و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین ، دەبینین نوسینەکەمان بە سەرکەوتیی بۆ دادەنێتەوە.

هەروەها دەتوانی، دوای ئەوەی شوێنی نوسینەکەت ئامادە کرد ، کلیکی ڕاست لەناو شوێنەکە بکەیت. واتە ئەو شوێنەی، کە دەتەوێ لێی دایبنێیت ، پاشان کلیکی چەپ لە سەرPaste بکە .



**ڕێگای دووەم :**

**هەروەها لە ڕێگایەکی تریشەوە، دەکرێ ئەم کارە ئەنجام بدەین، ئەویش بە هۆی ئەم هێمایە :**

**بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، دەکرێ سوود لەم هێمایە وەربگرین، کە لە سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەمان هەیە. سەرەتا بۆ ئەنجام دانی کارەکەمان ئەو شوێنە دیاری دەکەین، کە دەمانەوێت نوسینەکەی لێ دابنێین. دوای ئەوەی شوێنی نوسینەکەمان دیاری کرد، ئنجا بچۆ بۆ سەر ئەم هێمایە و کلیکی چەپی لە سەر بکە، دەبینی نوسینەکەت بۆ Paste دەکات .**



**ڕێگای سێ یەم :**

هەروەها بۆ ئـەنجام دانـی کـاری دانانـەوەی نووسـین ، دەکـرێ سـوود لـە کیبۆردیش وەربگرین .

سەرەتا ئەو شوێنە دیاری دەکەین ، کە دەمانەوێت نوسینەکەی لێ دابینێین. دوای ئەوەی شوێنی نوسینەکەمان دیاری کرد، ئنجا بچۆ بۆسەر کیبۆردەکەت، لەوێشەوە بە هۆی داگرتنی هەردوو دوگمەی V+ ctrl کارەکەمان بۆ ئەنجام دەدات .



# چۆنیەتی دیاری کردنی بەشە نوسینێك

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەکرێ ، سوود لە ماوس وەربگرین، ئەویش بەم شێوەیە: ماوسەکە دەبەینە سەر ئەوشوێنەی، کە دەمانەوێت دیاری بکەین، ئنجا کلیکی چەپ دابگرە، بەبێ ئەوەی دەست هەڵبگری، تا نوسینەکەت دیاری  دەکەی، ئنجا دەست لەسەر کلیکی چەپ هەلگرە، دەبینی ئەو بەشەی، کە ماوسەکەمان بە سەرداهێنا ئامادە کراوە، وەك لە وێنەکەدا دیارە .




هەروەها دەکرێ بەهۆی کیبۆردەوەش ئەم کارە ئەنجام بدرێ، ئەویش بە داگرتنی هەردوو دووگمەی → + shift ، یان هەر ئاراستەیەکی تر، واتە بۆ سەرێ، یان بۆلای چەپ، یان بۆ خوارەوە، یان بۆ لای ڕاست، دەتوانی کارەکەت ئەنجام بدەی .

## چۆنیەتی دیاری کردنی نوسین بە گشتی

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، دەکرێ بە چەند ڕێگایەك کارەکەمان ئەنجام بدەین :

**ڕێگای یەکەم :**

دەکرێ سوود لە لیستی Edit وەربگرین، ئەویش کلیکی چەپی لە سەر بکە، ئنجا بچۆ بۆ سەر بەشی select All و یەك کلیکی چەپی لە سەر بکە؛ دەبینی هەموو نوسینەکەت بۆ دیاری دەکات .



رێگای دووەم /

هەروەها دەتوانین بە ڕێگایەکی تریش کارەکەمان جێ بە جێ بکەین، ئەویش بە هۆی سوود وەرگرتن لە کیبۆردەوە. ئەگەر ویستت هەموو نوسینەکە دیاری بکەی، ئەوا دەتوانی بە هۆی هەردوو دوگمەی A + ctrl لە سەر کیبۆردەکە، ئەم کارە ئەنجام بدەی. بە داگرتنیان دەبینی بەئاسانی نوسینەکەمان بۆ ئامادە دەکات .



# چۆنیەتی سڕینەوەی بەشە نوسینێك

ئەگەر ویستمان وشەیەك، یان پیتێك بسڕینەوە، ئەوا سەرەتا ئەو وشەیە، یان ئەو پیتە ئامادە دەکەین، دوای ئەوەی وشەکە، یان پیتەکەت دیاری کرد، ئنجا دەچینە سەر لیستی Edit و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین ، پاشان دەچینە سەر بەشی Clear و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین؛ دەبینین وشە یان پیتە دیاریکراوەکە دەسڕێتەوە.

هەروا دەتوانین سوود لە دوگمەی Delete لەسەر کیبۆردەکە وەربگرین، ئەویش دوای ئەوەی نوسینەکەمان دیاری کرد، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر Delete ی سەر کیبۆردەکە دەکەین؛ دەبینی نوسینەکەت بۆ دەسڕێتەوە .



## چۆنیەتی خولانەوەی نوسینەکەمان

بابەتی سەرەکی ئەم کتێبەدا بریتیە لە چۆنیەتی خولانەوەی نوسین بە شێوەیەکی جوان .

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، سەرەتا دەبێت لاپەڕەیەکت ئامادە کردبێت. بۆ نمونە: من ئەو لاپەڕەیەم دروست کردووە، کە لە وێنەکەی خوارەوە دیارە، سەرەتا کلیکی چەپ لە سەر وێنەکە دەکەین، واتە ئامادەی دەکەین، دوای ئەوە دەچمە سەر لیستی slide show و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Custom Animation و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین؛ دەبینی شێوەیەکی ترت بۆ دەکرێتەوە. لەوێش لە دەستەڕاستی کۆمپیوتەرەکەت، بچۆ بۆ بەشی Add Effect و کلیکی چەپی لە سەر بکە، ئنجا لەوێشەوە بچۆ بۆ بەشی Entrance و کلیکی چەپی لە سەر بکە، لەوێشەوە بچۆ بۆ بەشی more Effects و کلیکی چەپ لە سەر ئەویش بکە؛ دەبینی شێوەیەکی ترت بۆ دەکرێتەوە .



دوای ئـەوەی شـێوەکەمان بـۆ دەرکـەوت، بـەکلیك کردنـت لەسـەر هـەر بەشـێکیان؛ چـۆنیەتی خولانـەوەی ئـەم بەشـەت نیـشان دەدات. جـا بـۆ ئەوەی بەشێوەیەکی جوان پەڕەکەت لێ دیـار بێـت، کلیکـی چـەپ لەسـەر نوسـراوی Add Entrance Effect بکـە و دەسـت هەڵمـەگرە، ئنجـا لیـستەکە هـەڵ بگـرە و بیبـە لای ڕاسـتی کۆمپیوتـەرەکـەت، بـۆ ئـەوەی پەڕەکەت بەجوانی بۆ دیار بێت. ئەوجا بـە ئـارەزووی خـۆت یـەکێك لـە جولانـەوەکان هەڵبـژێرە، بـۆ نمونـە: مـن ئـەم بەشـەیانم هەڵبـژاردووە: Box ، دوای ئەوەی هەڵتبژارد، کلیکی چەپ لە سەر ok بکە.

دوای ئـەوەی جـۆرە خولانەوەیـەکمان بـۆ وێنەکـەمان دیـاری کـرد، ئنجـا دێینـە سـەر بەشـێکی تـر، بـۆ نمونـە: دێینـە سـەر بەشـی چوارچـێوەی دەوری نوسراوی (ووتە) و کلیکی چەپی لە سـەر دەکـەین، واتـە ئامـادەی دەکەین، دەبێت تەنها چوارچێوەکە کلیکی چـەپی لـە سـەر کرابـێ، نـابێ نوسینەکەی لەگەڵ دابێت. دوای ئەوەی چوارچێوەکەت ئامادەکرد، ئنجـا بەهەمان شێوە دەچینە سـەر بەشـی Add Effect و کلیکـی چـەپی لـە سـەر دەکـەین، پاشـان لەوێـشەوە دەچـینە بەشـی Entrance و کلیکـی چـەپی لـە سـەر دەکـەین، لەوێـشەوە دەچـینە بەشـی more Effects و کلیکـی چـەپ لـە سـەر ئـەویش دەکـەین؛ دەبینـی شـێوەیەکی تـرت بـۆ دەگرێتەوە. بەئارەزووی خۆت شێوەیەك دیاری بکـە، ئنجـا کلیکـی چـەپ لە سەر ok بکە، بۆ چەسپاندنی.

ئەوجا دێینە سەر بەشێکی تر. بۆ نمونە: من دێمە سەر بەشی نوسراوی (ووتە) و کلیکی چەپی لە ناودا دەکەم، واتە ئامادەی دەکەم، ئەوجا بەهەمان شێوە جۆرە خولانەوەیەك بۆ ئەویش هەڵ دەبژێرم،

بۆ نمونە: من بەشی Zoom هەڵ بژاردووە، پاشان ok دەکەم. ئەوجا دێمە سەر بەشێکی تر، بۆ نمونە: کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەی دەوری ناوەرۆکی وتەکە دەکەم، واتە ئامادەی دەکەم، ئەوجا بەهەمان شێوە یەکێکیان بە ئارەزووی خۆم هەڵدەبژێرم، ئنجا ok دەکەم. ئەوجا دێمە سەر بەشێکی تر، بۆ نمونە: کلیکی چەپ لە ناو ناوەرۆکی وتەی زانایان دەکەم، بۆ ئەوەی نوسراوەکە ئامادەبێت، ئنجا بە هەمان شێوە بە ئارەزووی خۆم جۆرە خولانەوەیەك بۆ ئەویش هەڵ دەبژێرم، پاشان ok دەکەم. دوای ئەوەی هەموو بەشەکانت دیاری کرد؛ پێش ئەوەی لاپەرەکە بخەیتە سەر شاشەکە، دەتوانی هەر لە سەر لاپەڕەکە، بەهۆی کلیك کردن لە سەر play ، خولانەوەی هەموو بەشەکان یەك لە دوای یەك دووبارە بکەیتەوە .



# چۆنیەتی هێنانی نوسراو وشە وشە یان پیت پیت

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، واتە هێنانی وشە وشە، یان پیت پیت، لە جیاتی ئەوەی هەموو پێکەوە بێت، ئەوا دەبێت ئەم ڕێگایە بە کار بهێنین :

سەرەتا دەچینە سەر بەشی نوسراوی (ووتە) و کلیکی چەپی لەناودا دەکەین؛ دەبینین جۆرە خولانەوەکە لە دەستەراستی کۆمپیوتەرەکە ئامادە دەبێت، ئەوجا کلیکی چەپ لە سەر خولانەوەکەی تایبەت بە (ووتە) بکە، واتە بەشی سێیەم، وەك لە وێنەکە ئاماژەم بۆ کردووە، کلیکی چەپی لەسەر بکە؛ دەبینی لیستێکمان بۆ دەکاتەوە، جا لەوێشەوە بچۆ بۆ بەشی Timing و کلیکی چەپی لەسەر بکە، شێوەیەکی ترت بۆ دەکرێتەوە، کە لەو شێوەیە دەتوانی زۆربەی شتەکان بگۆڕیت.



**دوای ئەوەی ئەم شێوەیەمان بۆ دەرکەوت**




لــە بەشــی یەکــەم واتــە Effect ، دەتوانین چەند گۆڕانکاریەك بکەین. لە بەرامبەر Zoom دەتوانی کلیکی چەپ بکەیت، ئنجا یەکێکیان هەڵبژێرە. ئەمەیان چۆنیەتی هاتنی نوسینەکە دەگۆڕێت. بۆ نمونە: دەتوانی In بکەی بە out، یان هەر بەشێکی تر، کە پێت جوانە. لەبەشی خوارتر، لە بەرامبەر sound، دەتوانی بە ئارەزووی خۆت دەنگێك هەڵبژێری، ئنجا کلیکی چەپی لە سەر بکە. لە بەشی خوارتریش، لە بەرامبەر After animation، کلیکی چەپی لە سەر بکە، پاشان بە ئارەزووی خۆت لە بەشی more colors ڕەنگێك دیاری بکە، ئەمەیان واتای ئەوەیە، کە نوسینەکە گەیشتە شوێنەکەی خۆی، ڕەنگەکەی بگۆڕێ بۆ ئەو ڕەنگەی کە هەڵتبژاردووە.

لە بەشی خوارەوە، لە بەرامبەر نوسراوی Animate textدا کلیکی چەپی لە سەر دەکەی، ئنجا ئەگەر بتەوێ نوسینەکەت هەمووی بە یەك جار بێت، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی All at once بکە. ئەگەر بتەوێ نوسینەکەت وشە وشە بێت، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی By word بکە. ئەگەر بتەوێ نوسینەکەت پیت پیت بێت، ئەوا کلیکی چەپ لە سەر بەشی By letter بکە .




له بەشی دووەم دەتوانی هەندێ کاری تریش ئەنجام بدەیت. سەرەتا کلیکی چەپ له سەر نوسراوی Timing بکە، شێوەیەکی ترت بۆ دەردەکەوێت، له بەشی یەکەم، واتە له بەرامبەر بەشی start کلیکی چەپ دەکەیت، جا ئەگەر بتەوێ هەنگاوەکانی نوسینەکەت بە هۆی ماوسەوە، بێت ئەوا کلیکی چەپ له سەر بەشی on click بکە. ئەگەر بتەوێ هەموو بەشەکان بەیەکەوە بێن، واتە ئەگەر بتەوێ دوو نوسین یان زیاتر بە یەکەوە له یەك کات داخڵی ناو پەڕەکە ببن، ئەوا کلیك له سەر بەشی with previous بکە. ئەگەر بتەوێ هەموو بەشەکانی ناو لاپەڕەکە یەك بەدوای یەك دابێن، بێ ئەوەی ماوس یان کیبۆرد بەکار بهێنیت، ئەوا کلیکی چەپ له سەر بەشی After previous بکە .

لەبەشی خوارەوەتر، واتە بەشی Delay، دەتوانی بە ئارەزووی خۆت نوسینەکە دوابخەیت، ئەویش بە گۆڕینی ژمارەکە له سفرەوە بۆ ئەو ژمارەی کە خۆت دەتەوێ، واتە ژمارەی چرکەکانی دواکەوتنەکە دیاری دەکەی.

لەبەشی خوارەوەتر، واتە له بەرامبەر نوسراوی Repeat، کلیکی چەپ بکە، ئنجا دەتوانی بە ئارەزووی خۆت جۆری خێراییەکەی هەڵبژێری، ئەگەر بتەوێ زۆر خێرا بێ، ئەوا کلیکی چەپ له سەر بەشی Very

fast بکە. بە پێچەوانەوەش ئەگەر بتەوێ زۆر هێواش بێت، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی very slow بکە. بۆ مام ناوەندیەکەشی بەشی medium هەڵ بژێرە . ئەگەر بتەوێ لەمانەش هێواشتر بێت، کلیکی چەپ لە ناو نوسراوەکە دابگرە؛ دەبینی نوسینەکەی ناوی ئامادە دەبێت، یان کلیکی چەپ لەناو بۆشاییەکە دابگرە بەبێ ئەوەی دەست هەڵگری، تا هەموو نوسینەکە ئامادە دەکەی، ئنجا دەست هەڵگرە، دەبینی نوسینەکە ئامادە دەبێت. ئەوجا بەهۆی دوگمەی Delete لەسەر کیبۆردەکە نوسینەکە بسڕەوە، ئنجا ژمارەیەك بنووسە، کە ڕێژەی خێراییەکە دەنوێنێت.

لە بەشی خوارەوەش، واتە بەشی Repeat، کلیکی چەپی لەسەر بکە، ئنجا بە ئارەزووی خۆت ژمارەی جارەکانی دووبارە بوونەوەی نوسینەکەت هەڵ بژێرە. ئەگەر ئەو ژمارەیەی دەتەوێ هەڵیبژێری لە ناو لیستەکەدا نەبوو، ئەوا کلیکی چەپ لە ناو بۆشاییەکە بکە، یان بەهۆی داگرتنی کلیکی چەپ لە کۆتایی نوسینەکە بێ دەست هەڵگرتن تا هەموو نوسینەکە ئامادەدەکەی، ئنجا دەستی لەسەر هەڵبگرە، دەبینی نوسراوەکە ئامادە دەبێت، پاشان بەهۆی دوگمەی Delete نوسینەکە لابەرە، ئەوجا ئەو ژمارەیەی، کە دەتەوێ بۆ دووبارەبوونەوەی نوسینەکەت، لە ناو خانەکە بنووسە. ئەگەریش بتەوێ نوسینەکە بەردەوام دووبارە بێتەوە تا کلیك دەکەیت، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی Until Next click بکە.

دوای ئەوەی ئەوانەت هەموو دیاری کرد، ئەوجا بۆ چەسپاندنی کارەکەت، کلیکی چەپ لە سەر ok بکە.

هەروەها بۆ نوسینی گەورەش، یان هەر نوسینێکی تر، دەتوانی هەمان هەنگاو پەیڕەو بکەی . هەروەها دەتوانین هەندێ گۆڕانکاری لە سەر لاپەڕەکەش بکەین، ئەویش لە دەستەڕاستی کۆمپیوتەرەکەت، واتە لە بەرامبەر نوسراوی start، دەتوانی هاتنی نوسینەکە بە هۆی ماوس بێت، یان هەموویان پێکەوە بێن، یان یەك بەدوای یەکدا بێن. لە بەشی خوارەوەش، واتە بەشی Zoom، دەتوانی چۆنیەتی هاتنی نوسینەکە بگۆڕی. لە بەشی دواییدا، واتە بەشی speed دەتوانی جۆری خێراییەکە دەستکاری بکەی، بۆ زۆر هێواش، یان زۆر خێرا، یان مام ناوەند، یان هەر بەشێکی تر .



## چۆنیەتی هێنانی لاپەڕەکە بۆ سەر شاشە

**دوای ئەوەی لاپەڕەکەمان بە تەواوی ڕێک خست، ئنجا دێین لە سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەمان پیشانی دەدەینەوە.**

بۆ هێنانی لاپەڕەکە بۆ سەر شاشە، دەتوانین سوود لە چەند ڕێگایەك وەربگرین :

**ڕێگای یەکەم :**

بە بەکارهێنانی لیستی Viewیان لیستی slide show ؛ بە ئارەزووی خۆت کلیکی چەپ لەسەر هەر یەکێکیان بکە، پاشان بچۆ بۆ بەشی slide show و کلیکی چەپی لەسەر بکە؛ دەبینی لاپەڕەکەت بۆ دەخاتە سەر شاشەکە، بۆ پیشان دانەوەشی دەتوانی سوود لە ماوس و کیبۆرد وەربگری. ئەگەر بتەوێ بەهۆی ماوس کارەکە ئەنجام بدەی، ئەوا بۆ هەر بەشێك کلیکی چەپ دابگرە، ئەگەریش بتەوێ بە هۆی کیبۆردەوە بێت، ئەوا دەتوانی سوود لە دوگمە درێژەکەی خوارەوە وەربگری، واتە ئەم دوگمەیە: [ ] . بەڵام ئەگەر یەك جار ئەم دوگمەیەت داگرت، دەبێت چاوەڕێ بکەی، تا ئەو بەشە تەواو دەبێت، ئەوجا جارێکی تر دوگمەکە دابگرەوە، بۆ ئەوەی هەنگاوێکی ترت بۆ بهێنێت .



**ڕێگای دووەم :**

دەتوانین بە هۆی ئەم دوو هێمایە [Slide Show] که هەردووکیان لە سەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەمان هەیە، کاری هێنانی لاپەڕەکە بۆ سەر شاشە ئەنجام بدەین.

هێمای یەکەم واتە ئەم هێمایە [Slide Show] ، کە لەلای ڕاستی کۆمپیوتەرەکەمانە، ئەگەر کلیکی چەپی لەسەر بکەین، دەبینین لاپەڕەکەمان بۆ ڕەوانەی سەر شاشە دەکات. هێمای دووەم واتە ئەم هێمایە ، کە لەلای چەپی کۆمپیوتەرەکەمانە، ئەگەر کلیکی چەپی لە سەر بکەی، دەبینی لاپەڕەکەت بۆ ڕەوانەی سەر شاشە دەکات.

ئنجا بەهۆی کیبۆرد دەتوانی هەنگاوەکان پیشان بدەیتەوە . ئەگەر ماوس بەکاربهێنی، ئەوا ماوسەکە لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەت دەردەکەێت، لەگەڵ چەند هێمایەکی تر، بەڵام بەهۆی کیبۆردەوە هیچ هێمایەك دەرناکەوێت .



## چۆنیەتی هێنانی نوسین و پاشان چونەدەرەوەی نوسینەکە

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە سەرەتا لاپەرەیەکی تازە دەکەینەوە، ئنجا وێنە، یان نەخشێکی بۆ هەڵدەبژێرین، ئنجا بەهۆی text box نوسینێك دەنووسین، جا نوسینەکە کەم بێت یان زۆر هیچ جیاوازیەکی نیە. بۆ نمونە: من نوسیومە (بەرنامەی پاوەرپۆیینت). دوای ئەوەی نوسینەکەمان نووسی، نوسینەکە ئامادە دەکەین، واتە کلیکی چەپ لەناو نوسینەکە دەکەین، ئەوجا دەچینە سەر لیستی slide show و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، پاشان دەچینە سەر بەشی custom Animation و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، شێوەیەکی تر دەردەکەوێت، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Add Effect و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە بەشی Entrance و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە بەشی more Effects و کلیکی چەپ لەسەر ئەویش دەکەین؛ لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە، بۆ ئەوەی لاپەڕەکەمان بەتەواوی لێ دیاربێت، لیستەکە دەگوازینەوە بۆ لای ڕاستی کۆمپیوتەرەکە، ئەمەش بە داگرتنی کلیکی چەپ لە سەرەوەی لیستەکە و ڕاکێشانی بۆ لای ڕاستی کۆمپیۆتەرەگە، بێ ئەوەی دەست هەڵبگرین. بە کلیك کردن لەسەر هەر بەشێکیان، دەبینین شێوەی خولانەوەکەیمان پێشان دەدات، بەردەوام دەبین تا یەکێکیان بە ئارەزووی خۆمان دەبێ، دوای دیاریکردنی یەکێکیان، بۆ نمونە من ئەم بەشەیانم هەڵبژاردووە Boomerang، کە لە بەشی خوارەوە دایە، ئنجا بۆ چەسپاندنی کلیکی چەپ لە سەر ok دەکەین.

دوای دەستنیشانکردنی جۆری خولانەوەکە، ئەوجا دێین دەستکاری هەندێ شتی تر دەکەین. کلیکی چەپ لە سەر بەشە خولاوەکە بکە، ئەو بەشەی کە ئاماژەم بۆ کردووە ، ئنجا بـچۆ بـۆ بەشـی Timing و کلیکـی چەپی لەسـەر بکە؛ لیستێکی ترمان بۆ دەگرێتـەوە، لـە بەشی یەکەم، لە بەرامبـــــەر sound، دەنگێــــك هەڵدەبـژێری، کـە لەگـەڵ نوسـینەکە ئەو دەنگە دێت، کەهەڵتبژاردووە.




لـە بەرامبـەر After animation ڕەنگێك هەڵدەبـژێری، کە نوسـینەکە دوای خولانەوەکـەی ئـەو ڕەنگـە دەگـرێ. چـاکە هـیچ ڕەنگێـك هـەڵ نەبـژێری. لـە بەرامبـەر Animate textیـشدا، ئەگـەر شـێوازی هـاتنی نوسـینەکە دیـاری دەکـەیت، ئەگـەر بتەوێ هەموو پێکەوە بێت، ئـــەوا بەشی All at once دیاری بکە، ئەگەر بتەوێ نوسینەکەت وشەوشە بێت، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی By word بکە. ئەگەر بتەوێ نوسینەکەت پیت پیت بێت، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی By letter بکە. من بەشی By letterم هەڵبژاردووە، واتە ویستوومە نوسینەکە پیت پیت بێت.

لەبەشی دووەمیش هەندێ کاری تر هەیە، لەبەرامبەر start ، ئەگەر بتەوێ نوسینکە بەهۆی کلیکەوە بێت، ئەوا بەشی one click هەڵبژێرە. ئەگەر بتەوێ هەموو نوسینەکان لە یەك کاتدا بێن، واتە هەموویان بەیەکەوە دابەزن، ئەوا بەشی with previous هەڵبژێرە. ئەگەر بتەوێ نوسینەکە یەك بەدوای یەك بێن، ئەوا بەشی After previous هەڵبژێرە. لە بەرامبەر Delay ژمارەی چرکەکانی دواکەوتنی نوسینەکە دەنووسیت. لە بەرامبەر speed جۆری خێراییەکەی نوسینەکە دەگۆڕی. هەروا لە بەرامبەر Repeat ژمارەی جارەکانی دووبارەبوونەوەی نوسینەکە دیاری دەکەیت. پاش ئەوەی ئەمانەت تەواکرد، کلیکی چەپ لە سەر ok بکە.

بەمشێوەیە نوسینی یەکەممان تەواو کرد، ئنجا بەهەمان شێوە دووبارە کلیکی چەپ لەناو نوسینەکە بکە، ئەوجا لەلای ڕاستی کۆمپیوتەرەکەت بچۆ بۆ بەشی Add Effect و کلیکی چەپی لەسەر بکە، پاشان لەوێشەوە بچۆ بۆ بەشی Exit، لەوێشەوە بچۆ بۆ بەشیmore Effects، لیستێکت بۆ دەکرێتەوە، لیستەکە بگوازەوە بۆ لای ڕاستی کۆمپیوتەرەکەت، بۆ ئەوەی پەڕەکەت بە جوانی بۆ دەرکەوێت. پاشان بە ئارەزووی خۆت جۆرە چونەدەرەوەیەك هەڵبژێرە. بۆ نمونە: من ئەم بەشەم هەڵبژاردووە: Boomerang، واتە هەمان بەشی هاتنە ژوورەوە. دەشتوانی شێوەیەکی تر هەڵبژێری، بەڵام ئەگەر هەردووکیان لە یەك جۆر بن، کارەکەت جوانتر دەبێت، پاشان بۆ خێرای نوسینەکە یان بەشەکانی تر، هەمان هەنگاوەکانی پێشوو دووبارە بکەوە. هەروا دەتوانی هاتن و چونەدەرەوەی نوسینەکە چەندین جار دوبارە بێتەوە.

## چۆنیەتی چەندان نوسین لە سەر یەك وێنە پاشان چونەدەرەوەیان

سەرەتا لاپەڕەیەکی تازە دەکەینەوە، ئنجا وێنەیەك یان نەخشێك هەڵبژێرە، پاشان نوسینەکەت بنوسە. بۆ نمونە: من نوسیومە (بەرنامە)، لە خوارەوەش نوسینێکی تر بنوسە. بۆ نمونە: من نوسیومە (پاوەرپۆینت). واتە نوسینی دووەم تەواوکەری نوسینی یەکەمە. جا نوسینی یەکەم ئامادە دەکەم، واتە کلیکی چەپ لە ناویدا دەکەم، ئنجا دەچمە سەر بەشی خولانەوەی نوسینەکان، بۆ ئەوەی کارەکەمان زۆر جوان بێت، من ئەم بەشەیانم بەلاوە پەسەندە، fly in هەڵبژێرە، ئنجا ok بکە. لەم بەشەدا دەتوانی بە ئارەزووی خۆت چۆنیەتی هاتنی نوسینەکە بگۆریت، واتە لە سەرەوە بێت، یان لە خوارەوە بێت، یان لەسوچێکەوە بێت. ئەمانەش چەند دانەیەکن، کە دەتوانین دەستکارییان بکەین، واتە هەموویان ناتوانین ئەم کارەیان لە سەر بکەین. دوای ئەوەی ئەم بەشەمان هەڵبژارد، ئنجا دەمەوێت بەشی یەکەم لە سەرەوە بێتە خوارێ، کە ئەویش لەسەر شاشەکە بەم شێوەیە، جا لە بەرامبەر نوسراوی Direction کلیکی چەپی بکە، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر ئەم شێوەیە ↓ بکە. دەبینی نوسینەکەمان لە سەرەوە بۆ خوارەوە دێتە ناو لاپەڕەکە. ئنجا دێینە سەر بەشی دووەمی نوسراوەکە، واتە نوسراوی (پاوەرپۆینت)، بەهەمان ڕێگای پێشوو دوبارە بکەرەوە، بەڵام من دەمەوێت بەشی دووەم لە خوارەوە بێت، واتە لە بەشی Direction کلیکی چەپ بکەیت،

ئنجا ئەم شێوەیە↑ هەڵبژێرە، دەبینی نوسینەکە لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەبێت، واتە پێچەوانەی نوسینی یەکەم. دوای ئەنجامدانی ئەم کارەش، ئنجا دێینە سەر خێرایی نوسینەکەی یەکەم، لەسەر شاشەکە لە بەرامبەر نوسراوی Speed کلیکی چەپ بکە و، slow هەڵبژێرە. بۆ نوسینی دووەمیش هەمان خێرایی هەڵبژێرە، واتە Slow. ئنجا کلیکی چەپ لەسەر نوسراوی دووەم بکە، واتە نوسراوی (پاوەرپۆینت )، ئنجا لەسەر شاشەکە، لە بەرامبەر start ، لەوێشەوە on click بگۆڕە بۆ with previous، بۆ ئەوەی هەردوو نوسینەکە بە یەکەوە بێن .

سەرنجی وێنەکەی خوارەوە بدە و بەو شێوەیە ڕیزیان بکە .



دوای ئەوەی هەردوو نوسینەکەمان بە تەواوی ڕێك خست، ئنجا دێینە سەر بەشی چونەدەرەوەیان. سەرەتا کلیکی چەپ لەناو نوسراوی یەکەم دەکەین، واتە نوسراوی (بەرنامەی)، ئنجا دەچینە سەر بەشی Exit، لەوێ بە ئارەزووی خۆمان جۆرە چونەدەرەوەیەك هەڵ دەبژێرین. بۆ نمونە: من Boomerangم هەڵبژاردووە، واتە هەمان بەشی هاتنە ژوورەوە. ئنجا دێینە سەر بەشی دووەم، واتە بەشی (پاوەرپۆینت)، کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، واتە ئامادەی دەکەین، ئنجا دەچینە سەر بەشی Exit، لەوێش بە ئارەزووی خۆمان جۆرە چونە دەرەوەیەك هەڵ دەبژێرین، بۆ نمونە من Boomerangم هەڵبژاردووە، واتە هەمان بەشی هاتنە ژوورەوە. ئنجا دێینە سەر نوسینی یەکەم، واتە چونەدەرەوەکەی ئەمانە دەگۆڕین؛ خێراییەکەی دەکەین بە Slow، نوسینی دووەم، واتە چونەدەرەوەکەی، خێراییەکەی ئەویش دەکەین بە Slow. ئەمەش بۆ ئەوەیە، کە هەردوو نوسینەکە بە یەکەوە بێن و بەیەکەوە بڕۆنە دەرەوە. واتە ئەگەر خێراییەکەیان لێك جیاواز بێت، ئەوا یەکێکیان پێش ئەوەی تر دەکەوێت. ئنجا هەر نوسراوی دووەم، واتە چونە دەرەوەکەی، on click بگۆڕە بۆ with previous، تاوەکو هەردوو نوسینەکە بەیەکەوە بڕۆنە دەرەوە. وەك ئەم وێنەیە.



دوای ئـەوەی ئـەم کارانـەمان تـەواو کـرد، کلیکـی چـەپ لەسـەر play دەکەین، دەبینین کارەکەمان پێشان دەداتـەوە. ئەگـەر بمانـەوێ نوسـینی زیاتر بهێنین، واتە نوسینی زیاتر هەبێت، بـۆ ئەوەشـیان دەتـوانین دوای تـەواوکردنی نوسـینی یەکـەم و دووەم بـە چـاکی، نوسـینی یەکـەم، واتـە نوسراوی (بەرنامەی) copy دەکەین، ئنجا بـە هـۆی paste نوسـینەکە دادەنێینـەوە، دەبینـی بـە هـەموو بەشـەکان واتـە بـە چـوونەناوەوە و چونەدەرەوەش دانراوەتـەوە، بـەلآم بـۆ ئـەوەی کارەکـەمان ئاسـان و بـێ گرفـت بێـت، دەتـوانین ئـەم ڕێگایـە بـەکاربهێنین: دوگمـەی ctrl لەسـەر کیبۆرد دادەگـرین، دەبیـنین شـێوەی ماوسـەکە دەگـۆڕی، لەگـەڵ ئـەوەش کلیکی چەپی ماوسەکە لە ناو نوسـراوەکە دەکـەین، دەبینـی چـواردەوری نوسراوەکە بە دیار دەکەوێت، پاشان بەبێ ئەوەی دەست لەسەر دوگمەی ctrl هەڵبگرین، کلیکی چەپی ماوسـەکە لەسـەر چـواردەوری نوسـراوەکە دادەگرین، پاشان بـەبێ ئـەوەی کلیکـی چـەپ بەربـدەین، نوسـراوەکە بـۆ خـــوارەوە ڕادەکێـــشین، ئنجـــا کلیکـــی چـــەپ بـــەردەدەین، دەبینـــی نوسینەکەمان بە هەموو بەشەکانەوە بۆ دادەنێتەوە .



ئەگەر ئەم رێگایەت نەزانی، دەتوانی سەرلەنوێ نوسینێکی تر لەناو Textدا بنوسی و، چۆنیەتی هاتنە ژوورەوە و چونە دەرەوەی نوسینەکە دابنێیتەوە. بەلاَم ئەگەر بەهۆی رێگاکەی سەرەوە بیکەیت، ئەوا پیویست ناکات دوبارەی بکەیتەوە، بەلکو تەنها رێکی دەخەی، ئەویش بەم شێوەیە: هەردوو بەشەکانی Exit ببە لای یەك، واتە دەبێت هەردووکیان لەلای یەك بن، ئەویش بە هۆی ئەم هێمایە↓ دەتوانی بیان بەی بۆ لای یەکتر بەم شێوەیە؛ کلیکی چەپ لەسەر بەشی Exit بکە، دەبینی چالاك دەبێت، ئنجا بەهۆی هێمایەکەوە کلیکی چەپی لەسەر بکە، دەبینی بەشەکە دەهێنێتە خوارەوە. بۆ سەرەوەش ئەم هێمایە↑ بەکار دێت. دەتوانی بەهۆی ماوسیش ئەم کارە ئەنجام بدەی؛ کلیکی چەپ لە سەر بەشی Exit داگرە و هەڵی مەگرە، ئنجا بیهێنە بۆ خوارەوە، بۆ نوسینی دووەمیش هەمان هەنگاو دوبارەبکەرەوە، ئنجا نوسینەکانی دووەم بگۆڕە بۆ ئەو نوسینەی خۆت دەتەوێ. بۆ نمونە: من نوسینی دووەمم لە سەرەوە کردوە بە (ئامادەکردنی)، لە بەشی خوارەوەش کردوومە بە (هێمن حمە). ئنجا دەبێت نوسینەکان هەموویان لەسەر یەك بن، بۆ ئەوەی هەر نوسینەی لە شێوێنێك دەرنەکەوێت. بۆ نمونە من بەشی (ئامادەکردنی)م خستۆتە سەر بەشی (بەرنامەی)، بەهۆی کلیکی چەپ کردن لەسەر چواردەوری نوسینەکە، ئنجا گواستنەوەی بۆ سەر نوسراوی یەکەم. نوسراوی دووەمیش لە خوارەوە بگۆڕە، بۆ نمونە: من بەشی خوارەوەم کردووە بە (هێمن حمە ). ئنجا ئەویش بگوازەوە بۆ سەر نوسراوی یەکەم، بە هۆی کلیکی چەپ لەسەر کردنی بەبێ ئەوەی دەستی لەسەر هەڵبگری، ئنجا هەڵی بگرە بۆ سەر نوسراوی یەکەم، یان دەتوانی کلیکی چەپ لەسەر چواردەوری نوسراوەکە بکەی، پاشان بەهۆی ئەم هێمایە↑

لەسـەر کیبـۆرد، دەتـوانی نوسـراوەکە ببەیتـە سـەر هـی دووەم. دوای ئەویش هەردوو بەشی Exit ببە لای یەك، وەك هی یەکەم، واتە دەبێت دووبەشی Entrance لەلای یەك بن، واتە بەدوای یەك دابێن. ئنجا لە دوای ئـەوانیش دەبێـت دووبەشـی Exit بـەدوای یـەك دابێـت، واتـە دوو لەبەشی چوونە ناو و، دوو لەبەشی چونەدەر. جا چەند نوسینت ویست دەتـوانی هـەنگاوەکان دووبـارە بکەیتـەوە. بـەڵام نابێـت نوسـین پـێش نوسینێکی تر بخەی، واتـە نوسـینی دووەم نـابێ پـێش نوسـینی سـێیەم بکەوێ، دەبێت یـەك بـەدوای یـەك دابـێن. ئەگـەر پاش و پـێش کـەوتن، دەتوانی بەهۆی ماوس، یان بەهۆی ئەم هێمایە ⇕ ڕیزیان بکەیت.



## چۆنیەتی دروست کردنی چەند لا پەڕەیەك بەسەر یەکەوە

بۆ دروست کردنی چەند لاپەڕەیەک، واتە ئامادەکردنی چەند بابەتێک لە سەر یەک لاپەڕە،دەتوانین بەچەند ڕێگەیەک بیکەین:

ڕێگای یەکەم :

ئەگەر بتەوێ هەر لاپەڕەی بەشی خۆی هەبێت، واتە ئەگەر پەڕەی یەکەم تەواو بوو، لاپەڕەیەکی تر بکەیتەوە، ئەوا ئەم ڕێگایە بەکار بهێنە :

لاپەڕەیەکی تازە بکەوە، پاشان وێنەیەك یان ڕەنگێك هەڵبژێرە، ئنجا نوسراوەکەت بنوسە، ئنجا بۆ هەموو بەشەکان جۆرە خولانەوەیەك بە ئارەزووی خۆت هەڵبژێرە. دوای ئەوەی لاپەڕەی یەکەممان تەواو کرد و، شتی ترت مابوو، ئەوا دەتوانی New slideی تر بکەیتەوە، واتە لاپەڕەیەکی تر، ئەویش بەم شێوەیە؛ کلیکی چەپ لەسەر لیستی Insert بکە، ئنجا بچۆ بۆ بەشی New slide و کلیکی چەپی لەسەر بکە؛ دەبینی لاپەڕەیەکی تازەت بۆ دەکاتەوە. تۆ دەتوانی وەك لاپەڕەی یەکەم هەنگاوەکان دووبارە بکەیتەوە، واتە وێنەو پاشان نوسینەکەت بنوسە و، جۆرە خولانەوەیەکیان بۆ دابنێ، جا چەند لاپەڕەت دەوێ، هەمان هەنگاوەکانی پێشوو پەیڕەو بکە.



### ڕێگای دووەم :

هەروەها بۆ دروست کردنی چەند لاپەڕەیەك، دەتوانین سوود لەم هێمایە New Slide وەربگرین، کە لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە هەیە. پاش ئەوەی لاپەڕەی یەکەمت تەواو کرد و، نوسینی ترت مابوو، ئەگەر بتەوێ لاپەڕەیەکی تر بکەیتەوە، ئەوا دەتوانی کلیکی چەپ لەسەر ئەم هێمایە بکەی، کە لەسەر شاشەکەیە، دەبینی لاپەڕەیەکی ترت بۆ دەکاتەوە. تۆ دەتوانی وەك لاپەڕەی یەکەم هەنگاوەکان دووبارە بکەیتەوە، جا چەند لاپەڕت دەوێ، دەتوانی بە هەمان هەنگاوەکانی پێشوو ئەم کارە ئەنجام بدەی .

### ڕێگای سێ یەم :

هەروەها دەتوانی بە هۆی کیبۆردیش ئەم کارە ئەنجام بدەیت، ئەویش بە داگرتنی هەردوو دوکمەی M + ctrl ، دەبینی لاپەڕەیەکی تازەت بۆ دەکاتەوە، تۆ دەتوانی هەمان هەنگاوەکانی پێشو لاپەڕەکەت دروست بکەیتەوە.



هەر سەبارەت بەم بەشە، دواى ئەوەى لاپەڕەى يەكەمت تەواو كرد، ئەگەر بتەوێ لاپەڕەيەكى تريش دروست بكەى، دەتوانى لەسەر هەمان لاپەڕ، واتە لاپەڕەى يەكەم، لاپەڕەى دووەميش دروست بكەى، ئەويش بەم شێوەيە: دواى ئەوەى لاپەڕەى يەكەم تەواو بوو، لەسەر ليستى Drawing كليكى چەپ لە سەر ئەم هێمايە ☐ دەكەين، پاشان بەسەر لاپەڕەى يەكەمى دادەهێنم، واتە لاپەڕەى يەكەم دەشارێتەوە. وەك ئەوەى تازە دەست بكەين بە لاپەڕەى يەكەم، دواى ئەوەى وێنەيەكى بۆ هەڵ دەبژێرين، كە پێشتر باسى چۆنيەتى هەڵبژاردنى وێنە يان ڕەنگمان كرد، ئنجا نوسينەكەى لە ناودا دەنووسين، ئنجا جۆرە خولانەوەيەكى بۆ هەڵدەبژێرين، ئنجا نوسينەكە وا لێ دەكەين وشە وشە بێتە ناو شاشەكە .



## چۆنیەتی سرینەوەی بە شە لا پەڕەیەك واتە بەشە Sid یێك

بۆ ئەنجام دانی کاری سڕینەوەی لاپەڕەیەك، دەتوانین بە چەند ڕێگایەك کارەکەمان ئەنجام بدەین :

**ڕێگای یەکەم :**

بۆ سڕینەوەی بەشە Sid، سەرەتا دەبێت ئەو بەشە Sid ئامادە بکەی، ئەویش بەهۆی کلیکی چەپ لەسەر کردنی، کە کلیکی چەپت لەسەر کرد، دەبینی Sid ئامادە دەبێت. ئنجا بچۆ بۆ لیستی Edit و کلیکی چەپی لەسەر بکە؛ ئنجا بچۆ بۆ بەشی clear و کلیکی چەپی لەسەر بکە؛ دەبینی بەشە Sid دەسڕێتەوە. دەتوانی چەند لاپەڕەت دەوێ بیانسڕیتەوە، دەتوانی ئەم هەنگاوانەی پێشوو بۆ هەر بەشە Sid یێك دوبارە بکەیتەوە.



ڕێگای دووەم :




هەروەها دەتوانین ئەم کارە بەهۆی ماوس ئەنجام بدەین، ئەویش بەم شێوەیە: دەچینە سەر ئەو بەشە (Sid)ەی کە دەمانەوێت بیسڕینەوە، کلیکی ڕاستی لەسەر دەکەین، دەبینین لیستێك دەکاتەوە، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Delete slide و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ دەبینین بەشە (Sid)ەکەمان بۆ دەسڕێتەوە.

ڕێگای سێ یەم :

هەروەها بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەتوانین سوود لە کیبۆرد وەربگرین، ئەویش بەم شێوەیە: سەرەتا دەچینە سەر ئەو بەشە (Sid)ەی، کە دەمانەوێت بیسڕینەوە و، کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، واتە ئامادەی دەکەین، جا دوای ئەوەی ئامادەمان کرد، ئنجا دێینە سەر کیبۆرد، لەوێشەوە دەچینە سەر دوگەی Delete و دایدەگرین، دەبینین بەشە (Sid)ەکەمان بۆ دەسڕێتەوە .

هەروەها دەگرێ سوود لە Cut وەربگرین، ئەویش دوای ئەوەی بەشە (Sid)ەکەمان دیاری کرد، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر بەشی Cut دەکەین، دەبینیت بەشەکەمان بۆ دەسڕێتەوە .

## شێوەیەکی زۆر جوانتر بۆ خولانەوەی نوسینەکەمان

**هەروەها دەتوانین بۆ خولاندنەوەی نوسینەکەمان سوود لە بە شێکی تریش وەربگرین ئەویش بەم شێوەیە؛**

سەرەتا لاپەڕەیەکی تازە دەکەینەوە، ئنجا نوسینێك دەنووسین. بۆ نمونە: من وتەیەکم نوسیوە. ئنجا دەچینە سەر لیستی slide show و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین، ئنجا دەچینە سەر بەشی custom Animation و کلیکی چەپ لەسەر ئەویش دەکەین، لیستێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە، ئنجا کلیکی چەپ لەناو نوسراوەکە دەکەین، واتە ئامادەی دەکەین. دوای ئەوەی نوسراوەکەمان ئامادەکرد، دەچینە سەر بەشی Add Effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ لیستێکمان پێشان دەدات، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Emphasis و کلیکی چەپ لەسەر ئەویش دەکەین، لەوێشەوە دەچینە بەشی more Effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ دەبینی لیستێکمان بۆ دەکاتەوە.



بۆ ئەوەی لاپەڕەکەت بە جوانی بۆ دەرکەوێت، کلیکی چەپ لەسەر نوسراوەکەی سەرەوە بکە و، دەست هەڵمەگرە، لیستەکە هەڵبگرە بۆ لای ڕاستی کۆمپیوتەرەکەت. دوای ئەوە لەو لیستەدا دانەیەکیان هەڵبژێرە. کلیك کردنت لەسەر هەر بەشێکیان، دەبینی ئەو جۆرە یان چۆنیەتی خولانەوەی پێشان دەدات. بۆ نمونە: من بەشی waveم هەڵبژاردووە، دوای ئەوەی یەکێکت هەڵبژارد، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر ok بکە .

ئەگەر بتەوێ دەستکاری خێراییەکەی و بەشەکانی تر بکەی، ئەوا بۆ هەر بەشێك، کە دەتەوێ، هەنگاوەکانی پێشوو دووبارە بکەرەوە.



## چۆن دەتوانی خێراییەکە بۆ زۆر زۆر هێواش بگۆڕی

بۆ گۆڕینی خێرایی نوسینەکە، دوای ئەوەی جۆرە خولانەوەیەکمان بۆ نوسینەکە هەڵبژارد، کلیکی چەپ لەسەر بەشە خولاوەکە دەکەین، لیستێکمان پێشان دەدات، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Timing، کلیکی چەپ لەسەر ئەویش دەکەین، لیستێکی ترمان دەداتێ، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Timing و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکی ترمان دەداتێ، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی خێرایی، لە بەرامبەر speed یەك جار کلیکی چەپ لەناو بۆشاییەکە دەکەین و بۆشاییەکە ئامادە دەبێت. بە داگرتنی دوگمەی Delete لەسەر کیبۆردەکە، نوسینەکەی ناو بۆشاییەکە دەسڕینەوە .






ئەگەر بەم ڕێگایە ئامادە نەبوو، ئەوا لە کۆتایی نوسینەکە کلیکی چەپ دابگرە و بەبێ دەست هەڵگرتن، کلیکەکە ڕاکێشە تا هەموو نوسراوەکە ئامادە دەکەی، ئنجا دەست هەڵگرە؛ دەبینی نوسینەکە ئامادە دەبێت، بەهۆی دوگمەی Delete لەسەر کیبۆردەکە، نوسینەکەی ناو بۆشاییەکە دەسڕینەوە.

یان دوو جار کلیکی چەپ لە کۆتایی نوسینەکە بکە، دەبینی ماوسەکە لە کۆتایی نوسینەکە ئامادە دەبێت، بە هۆی دوگمەی Back لە سەر کیبۆردەکە پیت پیت نوسینەکە بسریتەوە.

دوای ئەوەی بە یەکێك لەو ڕێگایانە کارەکەمان ئەنجام دا، ئنجا دێین لەناو بۆشاییەکە ژمارەیەك دەنوسین، بەڵام نابێت ژمارەکە ئەوەندە زۆر بێت کە کۆمپیوتەر وەری نەگرێت. بۆ نمونە: من بۆ نوسینەکەی خۆم ژمارە (٣١)م داناوە، دوای ئەوەی ژمارەکەت نوسی، ئنجا کلیکی چەپ لە سەر ok بکە .



# چۆنیەتی نوسین لە ژێرەوەی لا پەڕەکە

سەرەتا نوسینێك لە بەشی خوارەوەی لاپەڕەکە لە ناو Tex دا بنووسە، ئەگەر نوسینەکەت زۆر بوو، دەبێت هەموو نوسینەکە بکەینە یەك ڕیز نوسین، واتە یەك دێر، ئەمەش بە گەورە کردنی چوارچێوەی دەوری نوسینەکەمان. چۆنیەتی بچوك کردنەوەشی بەم شێوەیە دەبێت؛ سەرەتا کلیکی چەپ لەناو نوسراوەکە دەکەین، دەبینی چوارچێوەکەی دەوری دەردەکەێت، ماوسەکە ببە سەر بازنەی ناوەراستی چوارچێوەکە لە بەشی لای چەپی کۆمپیوتەرەکە، دەبینی شێوەی ماوسەکە دەگۆڕێ بۆ ئەم شێوەیە: ⇔ . ئنجا کلیکی چەپ لەسەر بازنەکە دادەگرین، بەبێ دەست هەلگرتن رایدەکێشین بۆ لای چەپی کۆمپیوتەرەکە، ئنجا دەست هەڵدەگرین؛ دەبینی هەندێك دێر کەم دەبنەوە، ئنجا لاپەڕەکە بهێنەوە سەرەتای نوسینەکە بەهۆی خەتەکەی ژێریەوە، وەك لە وێنەکە ئاماژەم بۆ کردووە . ئنجا بە هەمان شێوە بچۆوە سەر بازنەکە، ئەمجاریش کارەکە دووبارە بکەرەوە، واتە رایکێشەوە، دەبینی هەندێکی تریش دێرەکان کەم دەبنەوە. بەم شێوەیە کارەکە دووبارە بکەوە، تا هەموو نوسینەکە دەکەیتە یەك دێر، ئەمەش بۆ ئەوەیە، تا نوسینەکە بەیەك دێر بێت، واتە نابێت دوو دێر لە سەر یەك بن.



دوای ئەوەی نوسینەکەمان کرد بە یەك دێر، ئنجا دێینەوە سەر لاپەڕەکە، واتە لەناو لاپەڕەکە. دەبینین نوسینەکە لە ناوەڕاستی لاپەڕەکەدایە، بۆ ئەوەی نوسینەکە لە خوارەوەی کۆمپیوتەرەکە بێت، دێین کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەی نوسینەکە دەکەین، پاشان بەبێ ئەوەی دەست هەلگرین، نوسینەکە دێنینە خوارەوەی لاپەڕەکە ، پاشان کلیکی چەپ لە ناو نوسینەکە دەکەین، واتە ئامادەی دەکەین، پاشان دەچینە سەر لیستی slide show و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، ئنجا دەچینە سەر بەشی custom Animation و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکمان دەداتێ لەلای راستی کۆمپیوتەرەکەمان. لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Add Effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Motion Paths و کلیکی چەپ لەسەر ئەویش دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Effect more و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکمان بۆ دەکاتەوە، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Right و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین. دەبینین پێشانمان دەدات، کە نوسینەکە بۆ کام لایە دەچێت، ئنجا ok بکە .



پاش ئەوەی کلیکی چەپمان لە سەر ok کرد ئەو جا دێین کلیکی چەپ لە شوێنێکی تر دەکەین بۆ نمونە من کلیکی چەپم لە سەر رەنگەکە کردووە ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەم تیشکە دەرکەوێت، دوای ئەوەی کلیکی چەپت لە شوێنێکی تر کرد، ئنجا بە دوای تیشکەکە دەگەڕێین، بۆ ئەمەش لاپەڕەکە ببە بۆ لای چەپی کۆمپیوتەرەکەت و، وورده وورده بڕۆ، تا دەگەیتە ئەم تیشکە، کاتێك گەیشتیە ئەم تیشکە، ماوسەکە ببە سەر بەشی یەکەمی تیشکەکە، واتە بەشە سورەکە، تا شێوەی ماوسەکە دەگۆڕێ، کە شێوەی ماوس گۆڕا، ئنجا کلیکی چەپ دابگرە؛ دەبینی تیشکەکە ئامادە دەبێت. دوای ئەوەی ئامادە بوو، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر بەشی یەکەم دابگرە، واتە بەشە سورەکە، بەبێ ئەوەی دەست هەلگری، ئنجا ڕایکێشە بۆ لای راستی کۆمپیوتەرەکەت، تا لە لاپەڕەکە تێپەڕ دەبێت، ئنجا لاپەڕەکە بهێنەوە بۆ سەر تیشکەکە، دوایی دوبارە تیشکەکە درێژ بکەوە. دوای ئەوەی تیشکەکەت بە تەواوی درێژکردەوە، بۆ ئەوەی بزانی کارەکەت تەوا بووە، کلیکی چەپ لەسەر play بکە، دەبینی کارەکەت بۆ دوبارە دەکاتەوە. ئەگەر نوسینەکە هەموو چووە دەرەوەی لاپەڕەکەت، واتە کارەکەت تەواو کردووە. بەلاّم ئەگەر نوسینەکە هەموو نەچووە دەرەوەی لاپەڕەکە، واتە تیشکەکەت بە تەواوی درێژ نەکردۆتەوە، بۆیە دەبێت دووبارە بچیتەوە سەر تیشکەکە، تا بە تەواوی درێژی دەکەیتەوە. دوای ئەوەی تیشکەکەمان بە تەواوی درێژکردەوە، واتە نوسینەکە لە ناو لاپەڕەکە نەدەمایەوە، ئنجا دێینە سەر خێراییەکەی؛ کلیکی چەپ لەسەر بەشە خولاوەکە بکە، ئنجا بچۆ بۆ بەشی Timing و کلیکی چەپی لەسەر بکە، لیستێکمان بۆ دەردەکەوێت، لەوێشەوە بچۆ بۆ بەشی speed و یەك کلیکی چەپ لەناو بۆشاییەکە بکە، دەبینی

نوسینی ناوی ئامادە دەبێت. دوای ئامادە بوونی نوسینەکە، بە هۆی دوگمەی Delete نوسینەکەی ناوی دەسڕیتەوە. دوای سڕینەوەی نوسینەکە، ئنجا دەتوانی ژمارەیەك بنوسیت. بۆ نمونە: بۆ نوسینەکەی خۆم ژمارە (٣١)م داناوە، دوای نوسینی ژمارەکە، کلیك لەسەر ok بکە. دەبینی نوسینەکە بە شێوەیەکی باش دەڕوات. دوای ئەوە ئەگەر خێراییەکەت بە دڵ نەبوو، دەتوانی بگەڕێتەوە بۆ سەر خێراییەکە، ئەگەر ویستت خێراتری بکەی، ژمارەکە کەم بکەوە، ئەگەر بتەوێ خێراییەکە کەمتر بکەیتەوە، ئەوا ژمارەکە زیاد بکە.

دوای تەواوکردی کارەکەمان بۆ جوان کردنی کارەکەمان دەتوانین چوارچێوەیەکی بۆ بکەین، ئەویش بەم شێوەیە: لە لیستی Drawing دەچینە سەر بەشی Auto shapes و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین، ئنجا شێوەیەکی جوان هەڵدەژێرین. بۆ نمونە من ئەم شێوەیەم هەڵبژاردووە □ ، دوای هەڵبژاردنی شێوەکە، دێین چوارچێوەکە بەئەندازەی لاپەڕەکە لە خوارەوە دەکێشین، واتە لەسەر نوسراوەکە، وەك لە وێنەکەی خوارەوە ئاماژەم بۆ کردووە .



دوای ئەوەی چوارچێوەکەمان بە دەوری نوسراوەکەدا کێشا، دەبینی نوسینەکە دیار نامێنێت. بۆ وەدیار خستنەوەشی؛ سەرەتا کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەکە دەکەین، واتە ئەو چوارچێوەی بۆ دەوری نوسینەکەمان داناوە، ئنجا دەچینەوە سەر لیستی Drawing، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Draw و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین. لیستێکمان دەداتێ، لەو لستە دەچینە سەر بەشی order، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی send Back و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین. دەبینین نوسینەکەمان بۆ بەدیار دەکەوێتەوە. دوای ئەوەی نوسینەکەمان بەدیار خستەوە، ئنجا چوارچێوەکە بە گوێرەی نوسینەکە رێك دەخەین، ئنجا ڕەنگەکەی ناوی دەگۆڕین، وەك لە ڕابردوو باسمان کرد.

بۆ زیاتر جوانکردنی لایەڕەکە دەتوانی چوارچێوەیەکی تر لە سەرەتا دابنێین، ئنجا لەسەری بنوسین. بۆ نمونە: من نوسیومە (ووتە)، یان هەر شتێکی تر، وەك لە وێنەکەی خوارەوە دیارە .



بەهەمان شێوە لە بەشیAuto shapes شێوەیەك هەڵبژێرە، ئنجا لە سەرەتای دەرکەوتنی نوسینەکە داینێ، پاشان ڕەنگەکەی ناوی بگۆڕە، ئنجا بەهۆی word Art نوسینەکە بنوسە، بەلآم دەبێت نوسینەکەت کەم بێت، جا لەسەر بەشە چوارچێوە بچوکەکە دای بنێ. سەرەنجی وێنەی من بدە و تۆش وابکە. لە بەشی دادێ باسی چۆنیەتی نوسینی word Art دەکەین .

دوای ئەوەی ئەمەشمان ئەنجام دا، ئنجا نوسینەکە، واتە ئەو نوسینەی کە نوسیومانە، دەبەینە دەرەوەی لاپەڕەکە، ئەویش بەم شێوەیە؛ کلیکی چەپ لەناو نوسینەکە دەکەین، چوارچێوەکەی دەردەکەوێت. کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەکە دەکەین و دەست هەڵناگرین، ئنجا هەڵی دەگرین تا دەیبەینە دەرەوەی لاپەڕەکە، ئەمەش بۆ ئەوەیە، تا نوسینەکە یەکسەر دەرنەکەوێت، واتە دەبێت نوسین لە دەرەوەی لاپەڕەکە دەست پێ بکات، نەك لە ناوەڕاستی لاپەڕەکە دەست بەرۆیشتن بکات. ئنجا ئەگەر هاتوو نوسینەکە هەمووی نەچووە دەرەوەی لاپەڕەکە، ئەوا دووبارە بچۆرەوە سەر تیشکەکە و زیاتر درێژی بکەرەوە .

تێبینی / لەکاتی درێژکردنەوەی تیشکەکەدا، نابێت خەتی تیشکەکە خوار بکەیت. واتە ئاگاداربە لە کاتی درێژکردنیدا، خەتەکە نەبەیتە سەرەوە یان خوارەوە، بەڵکو دەبێت ڕاست درێژی بکەیتەوە، چونکە ئەگەر خواری بکەی، ئەوا شێوازی هاتنی نوسینەکە تێك دەچێت. پاشان با کەمێك بۆشایی لە خوارەوەی چوارچێوەکەو چوارچێوە بچوکەکە هەبێت و نوسینەکەش بەرە سەرەوە .

## چۆنیەتی دەرکەوتنی دوو نوسین لە یەك کاتدا

بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، سەرەتا لاپەڕەیەکی تازە دەکەینەوە، ئنجا لاپەڕەیەکی جوان بە وێنەیەك و نوسین و چوارچێوە دروست بکە، ئنجا جۆرە خولانەوەیەك بۆ هەموو بەشەکان دیاری بکە، ئنجا لە بەشی خوارەوەی لاپەڕەکە، لەناو Text پارچە نوسینێك بنوسە، ئەگەر نوسینەکە زۆر بوو، دەبێت هەموو نوسینەکە بکەینە یەك دێر، پاشان یەك کلیکی چەپ لە ناو نوسراوەکە دەکەین، بۆ ئەوەی ئامادەبێت، ئنجا دەچینە ناوەڕاستی نوسینەکە و، لەوێشەوە بەهۆی بازنەی ناوەڕاستی نوسینەکەوە، لە سەرەوەی بازنەکە بازنەیەکی سەوز هەیە، ماوسەکەی دەبەینە سەر بازنەکەی سەرەوە، دەبینی شێوەی ماوسەکە دەگۆڕێ. دوای ئەوەی شێوەکەی گۆڕا، ئنجا کلیکی چەپ دابگرە و بەبێ دەست هەلگرتن بۆ لای چەپی کۆمپیوتەرەکە ڕاستی دەکەینەوە، پاشان دەچینە سەر بەشی slide show، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی custom Animation و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، پاشان لە دەستەڕاستی کۆمپیوتەرەکە، دەچینە بەشی Add Effect، لەوێشەوە دەچینە بەشی Motion Paths، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی more Effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینی لیستێکی ترمان بۆ دەکاتەوە، لەو لیستەدا دەچینە سەر بەشی Up، پاشان ok دەکەین، ئنجا تیشکەکە بەتەواوی بۆ سەرەوە درێژ دەکەینەوە، ئنجا دێینە سەر خێراییەکەی، ئەویش بە کلیك کردن لەسەر بەشە خولاوەکە، ئنجا لەوێشەوە دەچینە بەشی Timing و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە بەشی speed و یەك کلیکی چەپ لەناو بۆشاییەکە دەکەین، دەبینی نوسینی ناوی ئامادە دەبێت، ئنجا بەهۆی دوگمەی Delete نوسینەکەی ناوی دەسڕینەوە،

دوای ئەوە ژمارەیەك دەنوسین. بۆ نمونە من بۆ نوسینەکەی خۆم ژمارە (٣١)م داناوە. ئنجا کلیك لە سەر ok دەکەین.

پاش ئەوەی ئەو بەشانەمان تەواو کرد، ئنجا بۆ زیاتر جوانکردنی لاپەڕەکە، بە هەمان شێوە لەناو Text پارچە نوسینێکی تر دەنوسین، بەڵام ئەم بەشەیان، با لە ناوەڕاستی لاپەڕەکە بێت، ئنجا دەچینە بەشی Add Effect، لەوێشەوە دەچیتە بەشی Motion Paths، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی more Effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکی ترمان بۆ دەکاتەوە، لەناو لیستەکە دەچینە سەر بەشی Right، پاشان ok دەکەین، ئنجا تیشکەکە بەتەواوی درێژ دەکەینەوە، بەو شێوەیەی باسمان کرد. ئنجا دێینە سەر خێراییەکەی، ئەویش بەهەمان شێوەی یەکەم خێراییەکەی دادەنێینەوە، واتە با نوسراوی دووەمیش خێراییەکەی (٣١) بێت، پاشان ok دەکەین .



دوای ئەوەی ئەم بەشەشمان تەواوکرد، ئنجا دێینەوە سەر بەشی دووەم. کلیکی چەپ لەناو نوسینەکە دەکەین، بۆ ئەوەی ئامادەبێت، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەکەی دەوری دەکەین، بەبێ ئەوەی دەست هەڵگرین، ئنجا هەڵی دەگرین بۆ ناوەڕاستی لاپەڕەکە، لەوێشەوە ئەوجاریش کلیکی چەپی لەسەر دەکەین و بەبێ دەست هەڵگرتن، نوسینەکە دەبەینە دەرەوەی لاپەڕەکە، بۆ ئەوەی نوسینەکە لە ناوەڕاستی لاپەڕەکە دەست پێنەکات، بەڵکو دەبێت لە کۆتایی لاپەڕەکەوە دەربکەوێت. پاشان لە دەستەڕاستی کۆمپیوتەرەکە، لە بەرامبەر نوسراوی start، بەشی on click دەگۆڕین بۆ with previous، بۆ ئەوەی هەردوو نوسینەکان بە یەکەوە بێن. ئنجا دێینەوە سەر نوسینی یەکەم و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، بۆ ئەوەی ئامادەبێت، ئنجا ئەویش دەبەینە دەرەوەی لاپەڕەکە. ئنجا کلیکی چەپ لەسەر play دەکەین، بۆ ئەوەی بزانین نوسینەکان هیچ ناتەواویەکیان نیە. ئەگەر بینیمان نوسینێکیان تەواو نەچوەتە دەرەوەی لاپەڕەکە، دەبێت دووبارە تیشکەکە درێژتر بکەینەوە .



## چۆنیەتی گۆڕینی نوسین لە ئینگلیزیەوە بۆ عەرەبی

بۆ ئەنجا م دانی کاری گۆڕینی نوسین، بە دوو ڕێگا دەتوانین کارەکەمان ئەنجام بدەین :

**ڕێگای یەکەم :**

بە هۆی ئەم هێمایە AR دەتوانین زمانی نوسینەکە بگۆڕین، ئەویش بەم شێوەیە: کلیکی چەپ لەسەر هێماکە دەکەین، پاشان ئەگەر ویستمان زمانەکە بۆ ئینگلیزی بگۆڕین، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی En دەکەین، دەبینین زمانی نوسینەکە دەبێتە ئینگلیزی و دەتوانین بە زمانی ئینگلیزی بنوسین.

هەروەها دەتوانی کلیکی چەپ لەسەر هێماکە بکەی، ئنجا ئەگەر بمانەوێ زمانەکە بکەینە عەرەبی، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی AR دەکەین، دەبینین زمانی نوسینەکە دەکاتە عەرەبی.

ئەگەریش بمانەوێ بە کوردی بنووسین، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی فۆنتەکان دەکەین، ئنجا جۆرە فۆنتێکی کوردی هەڵدەبژێرین، ئنجا نوسینەکەمان بە کوردی دەنوسین.



ڕێگای دووەم :

هەروەها بۆ گۆڕینی زمان، دەتوانین بە شێوازێکی تریش کارەکەمان ئەنجام بدەین، ئەویش بەهۆی کیبۆردەوە ئەنجام دەدرێت. ئەگەر بمانەوێ نوسینەکە بکەینە زمانی ئینگلیزی، ئەوا هەردوو دوگمەی shift + ctrl ی لای چەپی کۆمپیوتەرەکە دادەگرین، دەبینین نوسینەکە دەکاتە نوسنی ئینگلیزی .

ئەگەر بمانەوێ نوسینەکە بکەینە نوسینی عەرەبی، ئەوا هەردوو دوگمەی shift + ctrl ی لای راستی کۆمپیوتەرەکە دادەگرین، دەبینین نوسینەکە دەکاتە نوسینی عەرەبی. لەوێشەوە بۆ نوسین بە زمانی کوردی، لە بەشی فۆنتەکان فۆنتێکی کوردی هەڵدەبژێرین و نوسینەکەمان دەنووسین .



بۆ گۆرینی زمان لە EN بۆ AR

بۆ گۆرینی زمان لە AR بۆ EN

## چۆنیەتی نوسین بە شێوەیەکی جوان بە (( word art ))

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، سەرەتا لە لیستی Drawing، دەچینە سەر بەشی word art، کە ئەمە شێوەکەیەتی و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە، لەو بەشە جۆرێکیان دیاری دەکەیت، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر ok دەکەیت، لیستێکی ترت بۆ دەکرێتەوە، لەو لیستەدا؛ ئەگەر زمانەکە ئینگلیزی بوو، ئەوا زمانەکە بگۆڕە، ئەوجا کلیکی چەپ لەسەر بەشی فۆنتەکان بکە و جۆرە فۆنتێکی کوردی دیاری بکەو کلیکی چەپی لەسەر بکە، ئنجا ئەم نوسینەی دەتەوێ لەوێدا بینوسە، ئنجا لەبەشی size دەتوانی قەبارەی نوسینەکە گەورەو بچوك بکەیتەوە، بە کلیك کردن لەسەر حەرفی B، نوسینەکە تۆخ تر دەبێت، بەکلیك کردن لەسەر حەرفی I نوسینەکە لار دەبێت، بۆ چاك کردنەوەشیان دووبارە کلیکی چەپیان لەسەر بکەوە، دەبینی نوسینەکە وەك خۆی لێ دێتەوە. ئنحا کە نوسینەکەت تەواو بوو، کلیك لە سەر ok بکە، دەبینی نوسینەکە ڕەوانەی سەر لاپەڕەکە دەکات .



## چۆنیەتی گۆڕینی ڕەنگ

ئـەو نوسـینەی کـە بـە word Art نوسـیومانە، ئەگـەر بمانـەوێ ڕەنگـەکانی بگـۆڕین، سـەرەتا کلیکـی چـەپ لەسـەر نوسـراوەکە دەکـەین، واتە ئامادەی دەکەین، ئەم لیستە دێتە سەر شاشە:




تێبینی: ئەم لیستە لیستی word Art واتە تایبەت بەو جۆرە نوسینەیە، ئەگەر ئەم لیستە لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە نەبوو، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر لیستی View دەکەین، لەوێشەوە دەچین بۆ بەشی Toolbares، لەوێ کلیکی چەپ لە بەردەم لیستی word Art دەکەین، دەبینین لیستەکە دەخاتە سەر شاشەکە.

کلیکی چەپ لەسەر هێمای دەکەین، دەبینین لیستێکمان بۆ دەکاتەوە، بە هەمان ئەو شێوازەی لە وانەکانی رابردوو باسم کرد، ڕەنگێك یان وێنەیەك یان نەخشێك هەڵدەبژێرین، کە تەواومان کرد، کلیك لەسەر ok دەکەین.

هەروەها ئەگەر کلیکی چەپ لەسەر هێمای ...Edit Text بکەین، دەبینین نوسینەکەمان پێشان دەداتەوە، جا ئەگەر هەر دەستکارییەکت هەبوو دەتوانی ئەنجامی بدەی. بۆ نمونە: ئەگەر وشەیەکت بەهەڵە نوسیبوو، دەتوانی ڕاستی بکەیتەوە، یان فۆنتی بگۆڕی.

ئەگەر کلیکی چەپ لەسەر هێمای بکەین، دەبینین لیستەکەت بۆ دەکاتەوە، ئەگەر ئەو شێوەیەی هەڵمانبژاردبو، بەدڵمان نەبوو، دەتوانین شێوەیەکی تر دیاری بکەین و ok بکەین، دوای ئەوەی ok دەکەین، فۆنتی نوسینەکە دەگۆڕێ، بۆیە پێویستە دووبارە فۆنتەکەی بگۆڕین.

ئەگەر کلیکی چەپ لەسەر هێمای بکەین، لیستێکمان دەداتی، یەکێکیان هەڵدەبژێرین، ئەمەیان نوسینەکە دەکاتە بازنە یان هەر شێوەیەکی تر لەو شێوانەی تێیدایە.

ئەگەر کلیکی چەپ لەسەر هێمای Aa بکەین، دەبینین گەورەیی هەموو نوسینەکە یەك ئاست دەبێت، ئەمەیان زیاتر بۆ نوسینی ئینگلیزی دەبێت.

ئەگەر کلیکی چەپ لەسەر هێمای بکەین، دەبینین نوسینەکەمان بۆ خوارەوە ریز دەکات، واتە نوسینەکە بۆ خوارەوە دەبێت، ئەمەشیان هەر زیاتر بۆ زمانی ئینگلیزی دەبێت .



## چۆنیەتی خولانەوەکەی

دوای ئەوەی نوسینێکمان بە ئارەزووی خۆمان ڕێك خست، ئنجا دەچینە سەر لیستی slide show و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، ئنجا دەچینە سەر بەشی custom Animation و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەلای راستی کۆمپیوتەرەکە لیستێکمان دەداتێ، لەوێش دەچینە سەر بەشی Effects Add و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Entrance و کلیکی چەپ لەسەر ئەویش دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی more Effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکمان بۆ دەکاتەوە. لەو لیستەدا جۆرە خولانەوەیەك هەڵدەبژێرین و ok دەکەین. ئنجا خێراییەکەی کەم و زیاد دەکەین. بەلاّم ناتوانین ئەم جۆرە نوسینە بکەینە وشە وشە، یان پیت پیت، چونکە بە word Art نوسراوە، بەلاّم دەتوانین هەموو بەشەکانی تری لە سەر جێبەجێ بکەین .

هەروەها دەتوانین سێبەریش بۆ نوسینەکە دابنێین، ئەویش بە سوود وەرگرتن لە هێمای ا ▪ ▪ لەسەر لیستی Drawing.

بە کلیك کردن لەسەر هێمای یەکەم، لەلای دەستەڕاستی کۆمپیوتەرەکە، لیستێکمان دەداتێ، جۆرە سێبەرێکی بۆ هەڵدەبژێرین. هێمای دووەم لە لای ڕاستی کۆمپیوتەرەکە، بە هەمان شێوە دەتوانی سێبەرێك هەڵبژێری، بەلاّم سێبەری بەشی یەکەم زیاترە لەهی سێبەری دووەم .

## چۆنیەتی نوسینی کوردی و ئینگلیزی لە سەر یەك

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، سەرەتا لاپەڕەیەکی تازە دەکەینەوە، پاشان پارچە نوسینێك لە ناو Text box دەنوسین، ئنجا ئەگەر نوسینەکە زۆر بوو، ئەوا دەبێت هەموو دێرەکان بکەینە یەك دێر، واتە نابێت دوو دێر لەسەر یەك بن. دوای ئەوەی نوسینەکەمان کردە یەك دێر، ئنجا کلیکی چەپ لە ناو نوسینەکە دەکەین بۆ ئامادەکردنی، دەبینین چوارچێوەکەی دەوری بەدیار دەکەوێت، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەکە دەکەین، بەبێ ئەوەی دەست هەلگرین، ئنجا نوسراوەکە دەهێنینە خوارەوەی لاپەڕەکە. ئنجا دەچینە سەر بەشی slide show، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی custom Animation و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، پاشان لە دەستەڕاستی کۆمپیوتەرەکە دەچینە بەشی Add Effect، لەوێشەوە دەچینە بەشی Motion Paths، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی more Effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین لیستێکی ترمان بۆ دەکاتەوە. ئنجا دەچینە سەر بەشی Right و ok دەکەین، ئنجا تیشکەکە بەتەواوی درێژ دەکەینەوە. ئنجا دێینە سەر خێراییەکەی، ئەویش بە کلیك کردن لەسەر بەشە خولاوەکە، ئنجا لەوێشەوە دەچینە بەشی Timing و کلیکی چەپ لەسەر ئەویش دەکەین، لەوێشەوە دەچینە بەشی speed و یەك کلیکی چەپ لەناو بۆشاییەکە دەکەین، دەبینین نوسینی ناوی ئامادە دەبێت، ئنجا بە هۆی دوگمەی Delete نوسینەکەی ناوی دەسڕینەوە، ئنجا ژمارەیەك دەنوسین. دوای ئەوەی ژمارەکەمان نوسی، کلیك لەسەر ok دەکەین.

دوای تەواو بوونی نوسینی یەکەم، ئنجا دێینە سەر نوسینی دووەم. بە هەمان شێوەی یەکەم، لەناو Text box دا نوسینێك دەنوسین، بەلاّم

ئەمجارە بە زمانی ئینگلیزی یان عەرەبی یان ئەویش بە کوردی بێت، لێرەدا دەمانەوێت بەشی دووەم بە زمانی ئینگلیزی بێت. دوای ئەوەی زمانەکە دەکەینە ئینگلیزی، ئنجا بەشە نوسینێك بە زمانی ئینگلیزی دەنوسین، ئنجا هەموو کارەکانی بەشی یەکەم دووبارە دەکەینەوە، بەلاّم لە جۆری خولانەوەکە، بۆ نوسینی ئینگلیزی بەشی Left هەلّدەبژێرین، تا پێچەوانەی نوسینی یەکەم بێت، واتە نوسینی یەکەم بۆ لای ڕاست بڕوا و نوسینی دووەم، واتە ئینگلیزییەکە بۆ لای چەپ بڕوا، چونکە ئاراستەی نوسینی هەردووزمانەکە لێك جیاوازن. با خێرایی نوسینی دووەمیش وەك هی یەکەم بێت. لە دەستەڕاستی کۆمپیوتەرەکە، لە بەرامبەر نوسراوی start بەشی on click دەگۆڕین بۆ with previous، تا هەردوو نوسینەکان بەیەکەوە بڕۆن. ئەگەر بتەوێ زمانی عەرەبیش زیاد بکەی، هەمان هەنگاوەکان دووبارە بکەوە .



## چۆنیەتی بە کارهێنانی وێنەی clip Art

بە دوو ڕێگا دەتوانیت سود لە وێنەی clip Art وەربگرین:

**ڕێگای یەکەم :**

دوای ئەوەی لاپەڕەیەکمان کردەوە، لەوێشەوە دەتوانین سوود لە لیستەکان وەربگرین. جا بۆ ئەم بەشە دەچینە سەر لیستی insert و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Picture، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی clip Art و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ لەلای راستی کۆمپیوتەرەکە لیستێکمان بۆ دەکاتەوە، بۆ چوونە ناو فایلی وێنەکان کلیکی چەپ لە سەر Go دەکەین، پاشا لە بەشی خوارتر وێنەیەك دیاری دەکەین و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین وێنەکە داخڵی ناو لاپەڕەکە دەکات. جا بە هۆی بازنەکانی دەوریەوە، دەتوانین بە ئارەزوومان وێنەکە بچوك و گەورە بکەینەوە.



**ڕێگای دووەم :**

بۆ هێنانی وێنەی clip Art بۆ ناو لاپەڕەکە، دەتوانین سوود لە هێماکانی سەر شاشەکە وەر بگرین، بە هۆی ئەم هێمایە لە لیستی Drawing دەتوانین وێنەکانی clip Art بهێنینە ناو لاپەڕەکە.

کلیکی چەپی لەسەر هێماکە دەکەین، لیستێکمان لەلای ڕاستی کۆمپیوتەرەکە بۆ دەکاتەوە، لەوێشەوە بۆ چوونە ناو وێنەکان، کلیکی چەپ لەسەر Go دەکەین، ئنجا لە بەشی خوارتر وێنەیەك دیاری دەکەین و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین وێنەکەمان بۆ داخڵی ناو لاپەڕەکە دەکات. کە دەتوانین بە هۆی بازنەکانی دەوریەوە، بە ئارەزووی خۆمان وێنەکە بچوك و گەورە بکەین.



## چۆنیەتی گۆڕینی ڕەنگی نوسینی ئاسایی

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، سەرەتا نوسینەکەت بنووسە، ئنجا ئەو بەشە نوسینە ئامادە بکە کە دەتەوێ ڕەنگەکەی بگۆڕی، واتە کلیکی چەپ لە کۆتایی بەشەکە دابگرە، بەبێ ئەوەی دەست هەڵبگری، تا بەشە نوسینەکەت دیاری دەکەی، ئنجا دەست هەلگرە. دوای ئەوەی نوسینەکەت دیاری کرد، ئنجا دێیە سەر لیستی Drawing، لەوێشەوە دەچیە سەر ئەم هێمایە A و کلیکی چەپی لەسەر دەکەیت، لەوێشەوە دەچیە سەر بەشی more colors و کلیکی چەپی لەسەر بکە؛ دەبینی لیستێکی رەنگت پێشان دەدات. جا ڕەنگێك دیاری دەکەی، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر بەشی Preview بکە؛ دەبینی نوسینەکە ئەو ڕەنگە وەردەگرێ کە دیاریت کردوە. ئەگەر بەدڵت نەبوو، دەتوانی ڕەنگێکی تر هەڵبژێری، پاشان ok بکە.



## چۆنیەتی خولانەوەی نوسین بە ئارەزووی خۆمان

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، سەرەتا لاپەڕەیەکی تازە دەکەینەوە، ئنجا پارچە نوسینێك دەنووسین. دوای ئەوەی نوسینەکەمان نوسیی، ئنجا کلیکی چەپ لەناو نوسینەکە دەکەین، تا ئامادە بێت، دوای ئەوە دەچینە سەر بەشی slide show، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی custom Animation و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، ئنجا لە دەستەڕاستی کۆمپیوتەرەکەوە دەچین بۆ بەشی motion paths، لەوێشەوە دەچین بۆ بەشی Draw custom Path، لیستێکی ترمان بۆ دەکاتەوە. لە بەشی یەکەم، واتە Line، کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، پاشان دەچینە ناو لاپەڕەکە، کلیکی چەپ دادەگرین، بەبێ ئەوەی دەست هەلگرین، بە ئارەزووی خۆمان خەتێك دەکێشین، دوای ئەوەی خەتەکەمان تەواو کرد، ئنجا دەست لەسەر کلیکی چەپ هەڵدەگرین، دەبینین نوسینەکە بەو خەتەدا دەڕوات کە هەڵمانبژاردووە .



هەروەها بەشی دووەم، واتە بەشی curve، دەتوانین کلیکی چەپی لەسەر بکەین، پاشان دەچینە ناو لاپەڕەکە، کلیکی چەپ دادەگرین، بەبێ ئەوەی دەست هەلگرین، ئنجا نەخشێك بۆ خۆمان دەکێشین. بۆ نمونە، نەخشی شاخێك دەکێشین، کە زۆر لە ووشەی W دەچێت، کە بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت: کلیکی چەپ لە شوێنێك دادەگرین، بەبێ ئەوەی دەست هەلگرین، ئنجا کەمێك بۆ خوارەوە درێژی دەکەینەوە، ئنجا دەست هەڵدەگرین، ئنجا کەمێك بۆ سەرەوەی دەبەین، بەبێ ئەوەی کلیکی چەپ دابگرین، کاتێك بۆ سەرەوەمان برد، ئنجا کلیکی چەپ دەکەین، بۆ ئەوەی لەوێ جێگیر بێت. جا دیسان کەمێك دەیهێنینەوە خوارێ، ئنجا کلیکی چەپ دادەگرینەوە، ئنجا دەیبەینەوە سەرەوە. ئنجا ئەگەر ویستمان کۆتایی پێ بهێنین، ئەوا لە کۆتاییەکەی دوو کلیکی چەپ لەسەریەك دادەگرین؛ دەبینین کۆتایی پێدێت. ئەگەر بمانەوێ نوسینەکە بچێتە دەرەوەی لاپەڕەکە، ئەوا تیشکەکە بە تەواوی بۆ دەرەوە ڕادەکێشین؛ دەبینین نوسینەکە بۆ دەرەوە دەچێت. ئنجا دەتوانی نوسینەکە بکەیتە وشە وشە، یان پیت پیت و، خێراییەکەشی کەم و زیتد بکەیتەوە، وەك لە پێشتر باسمان کرد .



هەروەها بەشی سێیەم، واتە بەشی Freeform، کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، پاشان دەچینە ناو لاپەڕەکە و شوێنێك هەڵدەبژێرین. جا کلیکی چەپ دادەگرین؛ دەبینین شێوەی ماوسەکە دەگۆڕێ بۆ قەڵەم، دەتوانین بە ئارەزووی خۆمان هەر شتێك بمانەوێ بیکێشین، یان هەر نوسینێك بنوسین، بۆ نمونە دەنوسین (هێمن). دوای ئەوەی نوسینەکەمان تەواوکرد، بۆ دەرچوون لێی، دوو کلیکی چەپ لەسەر یەك دادەگرین. پاشان ئەگەر بمانەوێ نوسینەکە بەو نەخشەیە بچێتە دەرەوەی لاپەڕەکە، دەتوانین تیشکەکە بە تەواوی درێژ بکەینەوە و، خێرایی و هاتنی ووشەکانیش بگۆڕین .

هەروەها بەشی چوارەمیش، واتە بەشی scribble بە هەمان شێوەی سێیەمە .

## چۆنیەتی دۆزینەوەی وشە

دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگەی لیستەکانەوە ئەنجام بدەین، ئەم دۆزینەوە بۆ نوسینی زۆر بەکار دێت.

دوای ئەوەی نوسینەکەمان نوسی، بۆ دۆزینەوەی وشەیەك، سەرەتا دەچینە سەر لیستی Edit، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Find و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکی ترمان بۆ دەکاتەوە. لە بەردەم بۆشایی find what ئەو وشەیە دەنوسین، کە دەمانەوێ بیدۆزیتەوە، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر find Next دەکەین، دەبینین وشەکەمان بۆ دەدۆزێیتەوە .

هەروەها دەتوانین بەهۆی کیبۆردەوەش ئەم کارە ئەنجام بدەین، ئەویش بە داگرتنی هەردوو دوگمەی ctrl + F، دەبینین لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە، بە هەمان شێوەی یەکەم کارەکان تەواو دەکەین .



## چۆنیەتی گۆڕینی وشە

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، لە هەمان لیستی Edit سوود وەردەگرین، کلیکی چەپ لەسەر لیستی Edit دەکەین، لەوێوە دەچینە سەر بەشی Replace و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ لیستێکی ترمان بۆ دەکاتەوە، لە بەردەم بۆشایی find what ئەو وشەیە دەنوسین کە دەمانەوێ بیگۆڕین، ئنجا لە بۆشایی دووەم، واتە لە بەردەم Replace with ئەو وشەیە دەنوسین، کە دەمانەوێ لە جێگەی وشەی یەکەمی دابنێین، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر Replace دەکەین، دەبینی وشەکەمان بۆ دەدۆزێتەوەو دەیگۆڕێت. ئەگەر بمانەوێ وشەیە لە هەموو شوێنەکان بگۆڕێت، واتە ئەگەر نوسراوێکی زۆرمان هەبێت و وشەکەش زۆر دووبارە بوبێتەوە و بشمانەوێ هەموو وشەکان بگۆڕین، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی Replace All دەکەین، دەبینین وشەکە لە هەموو شوێنەکان دەگۆڕێ .

هەروەها بەهۆی کیبۆردیش دەتوانرێت ئەم کارە ئەنجام بدرێت، بە داگرتنی هەردوو دوگمەی **H + ctrl** پێکەوە، لیستەکەمان بۆ دەکرێتەوە، جا هەمان کار دووبارە دەکەینەوە .



## چۆنیەتی نوسین بە هۆی ماوس لە سەر شاشەدا

ئەنجامدانی ئەم کارە زۆر ئاسانە، سەرەتا وێنەیەك، یان نەخشێکی جوان بۆ لاپەڕەکە دادەنێین، دوای ئەوە لاپەڕەکە ڕەوانەی سەر شاشە دەکەین، بەبێ ئەوەی هیچی لەسەر بنوسین، بەهۆی کلیك کردن لەسەر slide show یان ڕێگایەکانی تر. پاش ئەوەی پەرەکەمان خستە سەر شاشە، کەمێك دەوەستین، پاشان ماوسەکە دەجولێنین، دەبینین شێوەیەك لە بەشی چەپی خوارەوەی کۆمپیوتەرەکە دەردەکەوێت .




کلیکی چەپ لە سەر بەشی قەڵەم دادەگرین، کە لەوێنەکە ئاماژەمان بۆ کردووە؛ لیستێکمان بۆ دەردەکەوێت، ئنجا لەبەشی ink color ڕەنگێك بۆ نوسینەکەمان دیاری دەکەین، ئنجا کلیکی چەپی لەسەر بەشی Highlighter دەکەین، ئنجا دێینە ناو لاپەڕەکە، کلیکی چەپ دادەگرین و بەبێ دەست هەڵگرتن، هەر نووسینێك بمانەوێت، بەو ڕەنگەی هەڵمانبژاردوە، لەسەر لاپەڕەکە دەنووسین.

بەشێکی تر، واتە بەشی felt Tip pen، ئەگەر کلیکی چەپی لەسەر بکەیت، دەتوانی بە ئارەزووی خۆت لە ناو شاشەکە شتی پێ بنوسی، بەڵام ئەمەیان قەبارەکەی لە هی پێشوو بچوکترە.

بەشی سەرەوەتریش بە هەمان شێوەیە.

بۆ گۆڕینی ڕەنگیش لەبەشی ink color ڕەنگێك هەڵدەبژێری.

هەروەها بۆ سڕینەوەی بەشە نوسینێك، واتە وشەیەك، یان پیتێك، کلیکی چەپ لەسەر بەشی Eraser دەکەین، دەبینین شێوەی ماوسەکە دەبێتە ڕەشکەرەوە، ئنجا ڕەشکەرەوەکە دەبوینە سەر ئەو وشەیەی دەمانەوێ بیسڕیتەوە، کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ دەبینین وشەکە دەسڕێتەوە. ئەگەر بمانەوێ هەموو نوسینەکە بسڕینەوە، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی Erase All ink on slide دەکەین، دەبینین هەموو نوسینەکەمان بۆ دەسڕێتەوە.

پاش تەواوبوونی نوسینەکە، ئنجا کلیکی چەپ لەسەر قەلەمەکە دەکەینەوە، ئنجا دەچینە بەشی Arrow، واتە بەشی ماوسەکە و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، بۆ ئەوەی ماوسەکەمان بۆ دەرکەوێتەوە. دوای دەرکەوتنەوەی ماوسەکە، دوو کلیکی چەپ لەسەر یەك دەکەین، دەبینین لیستێکی ترمان دەداتی، ئەگەر بمانەوێ نوسینەکە داخڵی سەر لاپەڕەکە بکات، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی Keep دەکەین، دەبینین نوسینەکە داخڵی سەر لاپەڕەکە دەکات. ئەگەر بمانەوێ داخڵی سەر لاپەڕەکەی نەکات، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی Discard دەکەین، دەبینین هیچ نوسینێکمان بۆ ناهێنێتە سەر لاپەڕەکە .

دوای ئەوەی نوسینەکەمان داخڵی سەر لاپەڕەکە کرد، دەتوانین لەسەر لاپەڕەکەش هەندێ کاری تر بکەین، ئەویش بەم شێوەیە:

سەرەتا بۆ ئامادەکرنی کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، ئنجا دەچینە سەر ئەم هێمایە لە لیستی Drawing و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، پاشان دەچینە بەشی more Line colors و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکی ڕەنگمان بۆ دەکاتەوە، رەنگێك هەڵدەبژێرین، ئنجا ok دەکەین، دەبینین ڕەنگەکە داخڵی سەر نوسراوەکە دەکات .

بەلأم ناتوانی جۆری خولانەوەی بۆ دابنێیت .



# چۆنیەتی گۆڕینی شێوەی خولانەوەی نوسینەکە

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، سەرەتا لاپەڕەیەکی تازە بکەرەوە، ئنجا نوسینێك بنووسە، بەلاَم با نوسینەکە کەم بێت، دوای ئەوەی نوسینەکەت نوسیی، ئنجا دەچیە سەر بەشی Add Effects و کلیکی چەپی لەسەر دەکەیت، لەوێشەوە دەچیە سەر بەشی Motion Paths و کلیکی چەپ لەسەر ئەویش دەکەیت، لەوێشەوە دەچیە سەر بەشی more motion Paths و کلیکی چەپی لەسەر بکە، لیستێکت بۆ دەکرێتەوە، بە ئارەزووی خۆت بەشێکیان هەڵدەبژێری. بۆ ئەوەی کارەکە جوان بێت، من بەشی sine Wave م هەڵبژاردووە. پاشان ok بکە. ئنجا تیشکەکە بە تەواوی درێژ بکەرەوە، وەك باسمان کرد، دوای ئەوەی تیشکەت بە تەواوی درێژ کردەوە، ئنجا کلیك لەسەر بەشە خولاوەکە بکە، واتە بەشی تیشکەکە، دوای ئەوەی تیشکەکەت ئامادە کرد، واتە کلیکی چەپت لەسەر کرد، ئنجا لەلای ڕاستی کۆمپیوتەرەکەت بچۆ سەر بەشی Path و کلیکی چەپی لەسەر بکە، لیستێکت دەداتێ، لەوێشەوە دەچیە سەر بەشی Edit Points و کلیکی چەپی لەسەر دەکەیت، دەبینی شێوەی تیشکەکە دەگۆڕێ .



دوای ئەوەی شێوەی تیشکەکە، واتە خەتەکە گۆڕا، ماوسەکەی بخە سەر خاڵەکانی تیشکەکە، دەبینی شێوەی ماوسەکە دەگۆڕێ. ئنجا کلیك لەسەر یەکێك لە خاڵەکانی سەر تیشکەکەو دەست هەڵمەگرە، دەتوانی تیشکەکە بۆ سەرەوە یان بۆ خوارەوە یان بۆ لای ڕاست یان بۆ هەر شوێنێك، کە خۆت دەتەوێ بگوازیتەوە. دوای ئەوە دەتوانی خێراییەکەی کەم و زیاد بکەیتەوە و، چۆنیەتی هاتنی نوسینەکەش بۆ ناو لاپەڕەکە بکەیتە وشە وشە. ئنجا نوسینەکە ببە دەرەوەی لاپەڕەکە، بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ لەسەر شاشەکە دەرنەکەوێت. ئنجا تیشکەکە زیاتر درێژ بکەوە. دوای تەواو کردنی ئەم کارانە، ئنجا بەهۆی play دەتوانی کارەکە بۆ خۆت لێ بدەیتەوە. ئەگەر تێبینیت لەسەری هەبوو، دەتوانی دووبارە دەستکاری بکەیتەوە.



هەر لەو لیستەدا، واتە لیستی Path، کلیکی چەپی لە سەر بکە، ئنجا لەبەشی خوارەوە، کلیکی چەپی لەسەر Reverse Path Direction بکە، دەبینی جۆری هاتنی نوسینەکە پێچەوانە دەکاتەوە، واتە ئەگەر نوسینەکەت لە لای راست بۆ لای چەپ چووبێ، بە کلیك کردن لەسەر ئەو بەشە، پێچەوانە دەبێتەوە؟ واتە نوسینەکە لەلای چەپەوە بۆ لای راست دەڕوات. ئەگەر هەموو نوسینەکە نەچۆ دەرەوەی لاپەڕەکە، دەبێت تیشکەکە زیاتر درێژ بکەوە، ئنجا نوسینەکە ببە لایەکی دەرەوەی لاپەڕەکە، بۆ ئەوەی یەکسەر نوسینەکە لەسەر شاشە دەرنەکەوێت .



## چۆنیەتی هێنانی ڕاستەهێڵ بۆ لا پەڕەکە

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەتوانین سوود لە لیستەکان وەربگرین، ئەویش بەم شێوەیە:

دەچینە سەر لیستی View و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکمان بۆ دەکاتەوە. لەو لیستەدا دەچینە سەر بەشی Ruler و کلیکی چەپ لە بەردەمی دەکەین، دەبینی ڕاستەهێڵەکە دەردەکەوێت.



## چۆنیەتی زیاد کردنی Tool bars

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، دەتوانین سوود لە لیستەکان وەربگرین .

سەرەتا کلیکی چەپ لە سەر لیستی View دەکەین، لیستێکمان بۆ دەکاتەوە. لەو لیستەدا دەچینە سەر بەشی Tool bars، ئەویش لیستێکمان بۆ دەکاتەوە، کە هەموو بەشەکانی Tool bars ی تێدایە، ئەو بەشانەی کە لەسەر شاشەکە هەن، نیشانەی (☑)یان لەپێش دانراوە، کلیکی چەپ لە بەردەم هەر بەشێك بکەین، کە ئەو نیشانەی لەبەردەم نەبێت، دەبینین ئەو بەشەمان بۆ دێتە سەر شاشەکە.

بۆ لابردنی هەر بەشێکیش لەسەر شاشە، لە هەمان لیست، کلیکی چەپ لەسەر ئەو بەشە دەکەین، دەبینین بەشەکە لەسەر شاشە نامێنێت .



## چۆنیەتی هێنانی شاشە بچوکەکە بۆ لای ڕاست یان بۆ لای چەپ

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، دەتوانین سوود لە لیستەکان وەربگرین .
سەرەتا کلیکی چەپ لەسەر لیستی View دەکەین، لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە، لەو لیستە دەچینە سەر بەشی View Direction، دوو بەشمان بۆ دەکرێتەوە. ئەگەر بمانەوێ شاشەکە بێتە لای راست، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی Right to Left دەکەین، دەبینین شاشە بچوکەکە دێتە لای ڕاستی کۆمپیوتەرەکە.
ئەگەر بمانەوێ شاشەکە بێتە لای چەپی کۆمپیوتەرەکە، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی Left to Right دەکەین، دەبینین شاشە بچوکەکە دێتە لای چەپی کۆمپیوتەرەکە، وەك لەوێنەکەدا دیارە .



# چۆنیەتی گەورەکردنی لا پەڕەکە

بـۆ گـەورەتر یـان گـچکەتر پیـشاندانی لاپەڕەکـە، دەتـوانین سـوود لـە لیستەکان وەربگرین .

سـەرەتا دەچینـە سـەر لیـستیView و کلیکی چـەپی لەسـەر دەکـەین، لیستێکمان بـۆ دەکاتـەوە. لـەو لیـستەدا دەچینـە سـەر بەشـی Zoom و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیـستێکمان دەداتـێ، کـە چـەند ڕێژەیـەکی تێدایە، کلیکی چەپ لەناو بازنەکەی بـەردەمی هـەر یـەکێکیان بکـەی و، ok بکەی، دەبینی لاپەڕەکە بەو ڕێژەیە گەورەتر و بچوکتر دەبێت.

هەر لەو لیستە، لەلای ڕاست و لە خوار نوسراوی Percent ،بۆشاییەك هەیە، دەتوانی ڕێژەی گەورەبوونەکە بووسیت.

بـۆ ئـەوەی کارەکانمـان بـە ئاسانی لەسـەر لاپەڕەکـە جێبـەجێ بکـەین، (Fit) باشترین ڕێژەی گونجاوە، کە لاپەڕەکە بە تەواوی دیار بێت.



## چۆنیەتی دانانی بەروار بۆ نوسینەکەمان

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە دەتوانین سوود لە لیستی Insert وەربگرین . دوای ئـەوەی نوسـینەکەمان نوسـیی، ئەگـەر ویـستمان بـەرواری بـۆ دابنێین، ئەم هەنگاوانە پەیڕەو دەکەین.

سـەرەتا ئـەو شـوێنە دیـاری دەکـەین، کـە دەمانـەوێ بەروارەکـەی لێ دابنێین، بۆ نمونە مـن خـەتی کۆتـاییم هەڵبـژاردووە. دوای دیـاریکردنی شـوێنەکە، کلیکـی چـەپ لەسـەر لیـستی Insert دەکـەین، لیـستەکە دەبێتـەوە، لـەو لیـستە دەچینە بەشـی Date and Time و کلیکـی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکمان بۆ دەکاتەوە. لە بەشی Language زمـانی بەروارەکـە (ئینگلیـزی یـان عـەرەبی) هەڵدەبـژێرین. بـۆ نمونـە ئینگلیزی هەڵدەبژێرین. بۆ دیاریکردنی جۆری بەروارەکە؛ (کۆچـی یـان زایینی) لە خوارەوەتر، لەژێر نوسراوی calendar type کلیکی چـەپ دەکەین، ئنجا بەروارەکـە دەگۆڕین بـۆ کۆچـی یـان بەشـەکەی تـر، دوای ئەوە جۆرە ڕیزبوونێك بۆ بەروارەکە هەڵدەبژێرین، ئنجا کلیـك لەسـەر ok دەکەین، دەبینین بەروارەکە لە خوار نوسینەکە دادەنێت .



# چۆنیەتی دروستکردنی خشتەك

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، سوود لە هەمان لیستی Insert وەردەگرین، ئەویش بەم شێوەیە:

کلیکی چەپ لەسەر لیستی Insert دەکەین، لەوێشەوە کلیك لەسەر بەشی Table دەکەین، خشتەیەکمان دەداتێ، لە بەشی یەکەم، واتە بەشی Number of columns ژمارەی ستونی خانەکانی ئەو خشتەی دەمانەوێ، دەنوسین، بە هۆی کلیك کردن لەسەر دوو دوگمەکان ، بەشی سەرەوە بۆ زیادکردنی ژمارەکەیە و، بەشی خوارەوەش بۆ کەمکردنەوەی ژمارەکەیە. لە بەشی دووەم واتە بەشی Number of rows ژماری ئاسۆیی خانەکانی خشتەکەمان دەنووسین، بەهۆی بەشی سەرەوە بۆ زیادکردنی ژمارەکەیە و بەشی خوارەوەش بۆ کەمکردنەوەی. پاشان ok دەکەین .



## چۆنیەتی نوسین لە ناو خشتەکە

دوای ئەوەی خشتەکەمان دروست کرد، ئنجا دێینە سەر نوسین لە ناو خشتەکە. بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، سەرەتا قەبارە و جۆری فۆنتەکە دیاری دەکەین، ئنجا نوسین دەنووسین. بۆ نمونە لێرە هەندێك وشەی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزیمان نوسیوە. دوای ئەوەی نوسینەکەمان نوسیی، دەتوانین ڕەنگێکیشی بۆ هەڵبژێرین. بۆ ئەوەش سەرەتا کلیکی چەپ لەسەر چوارچێوەکەی دەوری دەکەین، نابێت ماوسەکە بجوڵێ، چونکە ئەگەر ماوسەکە لەناو خانەیەك بجوڵێ، ئەوا تەنها ئەو خانە دیاری دەکات، کەواتە دەبێت هەموو بەیەکەوە ئامادەبێت. ئنجا کلیکی چەپ لەسەر ئەم هێمایە دەکەین، ئنجا ئەگەر بمانەوێ ڕەنگێکی بۆ دابنێین، کلیکی چەپ لەسەر بەشی more fill colors دەکەین، لەوێ ڕەنگێك هەڵدەبژێرین. ئەگەر بمانەوێ نەخش یان وێنە هەڵبژێرین، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی fill Effects دەکەین، پاشان هەنگاوەکانی رابردوو دووبارە دەکەینەوە.

بۆ خولاندنەوەکەشی، هەمان هەنگاوەکانی رابردوو دوبارە دەکەینەوەو خێراییەکەی دەستکاری دەکەین، بەلاّم ناتوانین وابکەین نوسراوەکە وشە وشە یان پیت پیت بێت، بەڵکو هەموو پێکەوە دێت.



## چۆنیەتی دانانی ژمارە بۆ دێرەکان

دەتوانین لە ڕێگای لیستەکان ئەم کارە ئەنجام بدەین:

سەرەتا بەهۆی Tex Box شوێنێك بۆ نوسینەکە دەکەینەوە، ئنجا دەچینە سەر لیستی Format و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، ئنجا دەچینە سەر بەشی Bullets and Numbering و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین لیستێکمان بۆ دەکاتەوە. ئەگەر شوێنمان بۆ نوسینەکەمان نەکردبێتەوە دەبینی کارەکەمان بۆ ئەنجام نادرێت .

دوای ئەوەی کلیکمان لەسەر کرد و لیستەکەی کردەوە، لەسەر بەشی یەکەم Bulleted کلیکی چەپدەکەین، لیستێکمان بۆ دەکاتەوە، لەو لیستەدا لە ناو چوارچێوەکە جۆرە هێمایەك هەڵدەبژێرین و کلیکی لەسەر دەکەین. هەروا دەتوانین هەندێ گۆڕانکاری تریش بکەین، لە بەشی خوارەوە، بەهۆی بەشی size دەتوانین قەبارەی بازنەکە کەم و زیاد بکەین.



هەروەها دەتوانین ڕەنگەکەشی بگۆڕین، ئەویش بەم شێوەیە:
هەر لە خوارەوەی ئەو لیستە، کلیکی چەپ لەسەر بەشی color دەکەین، لەوێشەوە دەچینە بەشی More colors و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێ ڕەنگێك بۆ بازنەکە یان هەربەشێکی تر هەڵدەبژێرین. هەروەها لەلای ڕاستی خوارەوەی لیستەکە، ئەگەر کلیکی چەپ لەسەر بەشی Picture بکەین، لیستێکمان بۆ دەکاتەوە، دەتوانین وێنەیەك هەڵبژێرین و، ئنجا کلیك لەسەر ok دەکەین.
هەروەها لە بەشی خوارتر، واتە بەشی customize، ئەگەر کلیکی چەپ بکەین، دەبینین لیستێکمان بۆ دەکاتەوە، لەو لیستەدا دەتوانین پیتێك یان هێمایەك یان هەر شتێکی تر سەرەتای نوسینەکەمان هەڵبژێرین، پاشان ok دەکەین .
لە بەشی دووەم، واتە بەشی Numbered، ئەگەر کلیکی چەپ بکەین، لیستێکی ترمان بۆ دەکاتەوە، لەوێ دەتوانین جۆرێکیان هەڵبژێرین، بۆ نمونە بەشی ژمارەکان هەڵدەبژێرین، واتە (١ ٢ ٣)، دوای دەستنیشان کردنی، لەلای ڕاست بەهۆی start at، دەتوانی ئەو ژمارەیە دیاری بکەی کە لەوێ دەست پێ بکات، بۆ نمونە بە ژمارە (٢٠) دەست پێ بکات. لەلای چەپیش قەبارەو ڕەنگەکەی دەستکاری دەکەین.
ئنجا ok دەکەین.



# چۆنیەتی ریزکردنی نوسین

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، سەرەتا پارچە نوسینێك دەنوسین، کە لە سێ دێر کەمتر نەبێت. ئنجا دەچینە سەر لیستی format و کلیکی چەپی لە سەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Alignment، لەوێ ئەگەر بمانەوێ نوسینەکە لەلای چەپ بێت، ئەوا کلیکی چەپ لەسەر بەشی Alight Left دەکەین، بۆ ناوەراستی کۆمپیوتەریش بەشی center هەڵدەبژێرین، بۆ لای راستی کۆمپیوتەرەکەش بەشی Alight Right هەڵدەبژێرین، بۆ ئەوەی دێرەکانی هەموو لە یەك ئاست کۆتایی پێ بێت، بەشی Justify Low هەڵدەبژێرین. دەبینین نوسینەکە هەموو لە یەك ئاست دادەبێت، بەڵام بەشی Justify ئاستی کۆتایی نوسین رێك دەخات، بەڵام ئەمەیان بۆشایی لە نێوان وشەکان دروست دەکات، بۆیە بەشی یەکەم باشترە .



## چۆنیەتی هێنانی وێنەی جوانی ئامادەکراو

دەتوانین لە ڕێگەی لیستەکانەوە ئەم کارە ئەنجام بدەین.

سەرەتا لاپەڕەیەکی تازە دەکەینەوە، بەڵام با لاپەڕەکە ساف بێت، واتە ئەم شێوەیان بێت ☐ ، دوای ئەوەی لاپەڕەکەمان هەڵبژارد، ئنجا دەچینە سەر لیستی Format و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی slide Design و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین لەلای راستی کۆمپیوتەرەکەت لیستێکمان بۆ دەکاتەوە، کە چەندان وێنەی جوانی ئامادەکراوی تێدایە، وێنەیەك هەڵدەبژێرین و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین وێنەکە داخڵی ناو لاپەڕەکە دەکات، دەتوانین شتی لەسەر بنوسی، بەڵام ناتوانین جۆری خولانەوە بۆ وێنەکە هەڵبژێرین .



# چۆنیەتی دروست کردنی بەرنامەیەکی پرسیار و وەڵام

یەکێك لە کارە گرنگەکانی بەرنامەی پاوەرپۆینت، دروست کردنی بەرنامەیە بەشێوەی پرسیار و وەڵام، کە لە زۆربەی کەناڵەکان دەبینرێت، هەرچەند مەرج نییە هەموویان بە بەرنامەی پاوەرپۆینت کرابن، بەڵکو بە بەرنامەی تریش ئەم کارە دەکرێت. ئێستاش دێینە سەر چۆنیەتی ئەنجام دانی ئەم کارە:

سەرەتا بەرنامەکە بکەوە، ئینجا بنوسە، دوای ئەوە جۆرە جوڵەیەکی بۆ هەڵبژێرە، وەك لە رابردوو باسمان کرد. ئینجا لاپەڕەکە لە بەشەهاردێك بپارێزە، واتە (save)ی بکە. دەتوانی جوانترین شێوە بۆ خۆت دروست بکەی، واتە دەتوانی سەرەتا پرسیارەکە لەناو چوارچێوەکە بنوسی، پاشان دەتوانی لە ژێرەوە ( ٣ ) وەڵام بنوسی، کە یەکێکیان ڕاست بێت و دوویان هەڵە بن . وەك ئەم نمونەی خوارەوە :



دوای ئەوەی شێوەیەکەت دروست کرد و (save)ت کرد، ئنجا دێین لاپەڕەیەکی تازە بکەوە، ئینجا کلیك لەسەر بەشی Auto shapes بکە، لەوێشەوە بچۆ سەر بەشی Action Buttons، دەبینی چەند بەشێك دەکرێتەوە، دەتوانی بەشە سادەکە هەڵبژێری، واتە ئەوەی لەوێنەکە ئاماژەی بۆ کراوە .




ئینجا کلیکی چەپی لە سەر بکە، دەبینی شێوەی ماوسەکە دەگۆڕێت، ئینجا لە شوێنێکی ناو لاپەڕەکە کلیکی چەپ دابگرە، پاشان چوارگۆشەیەك بکێشە. بۆ ئەوەی کارەکەت جوان بێت، با چوارگۆشەکە گەورە نەبێت. ئینجا دەست هەڵگرە، دەبینی راستەوخۆ شێوەیەکی ترمان بۆ دەکرێتەوە.



دوای ئەوەی شێوەکە کرایەوە، کلیك لەناو خانەی Hyperlink to بکە، کە دیاری کراوە، پاشان کلیك لەسەر بەشی لیستەکان بکە، دەبینی لیستێکت بۆ دەکرێتەوە، تۆش بچۆ بۆ بەشی کۆتایی، واتە بەشی other file، وەك لە وێنەکەدا دیاریکراوە، کلیکی چەپی لەسەر بکە، دەبینی لیستێکت بۆ دەکرێتەوە، تۆ بچۆ بۆ ئەو بەشەهاردەی کە فایلەکەت تێدا پاراستووە، دوای ئەوەی فایلەکەت دۆزیەوە، کلیکی لەسەر بکە، ئنجا ok بکە.

ئنجا دەتوانی بە ئارەزووی خۆت دەنگێکیشی لە گەڵ دابـەزێنی، ئـەویش لە ڕێگەی play sound لە بەشی خـوارەوە، کـە لەوێنەکـەدا ئامـاژەی بۆ کراوە. ئنجا دەنگێك هەڵبژێرە، دوای ئەوە ok بکە.

ئەگەر بتەوێ ڕەنگی بەشەکە بگۆڕی، ئـەوا کلیکـی چـەپی لەسـەر بکـە و بەهۆی هێمای ڕەنگەکەی بگۆڕە، وەك پێشتر باسمان کرد .

دوای ئەوەی کارەکەت تەواو کرد، ئینجا کلیك لە سـەر(F5)، یـان لەسـەر لیـستی silde show بکـە، لەوێـشەوە بـچۆ بـۆ سـەر بەشـی view show، دەبینـی لاپەڕەکـەت بـۆ دەخاتـە سـەر شاشـەی کۆمپوتەرەکـە، ئینجا ماوسەکە بجوڵێنە، بۆ ئـەوەی ماوسـەکە دەربکـەوێ، ئینجـا کلیکـی چـەپ لەسـەر ئـەو بەشـە بکـە، کـە دروسـتت کـرد؛ دەبینـی چ شـتێکت نوسیبوو، بە هەمان جوڵەوە پێشانت دەداتەوە .

ئینجا چەند بەش بتەوێ، دەتوانی هەمان هەنگاوەکان دووبارە بکەیەوە، ئەگەر ژمارەی خانەکان زۆر بوون، دەتوانی بە شێوەیەکی جوان ڕیزیان بکەی، ئەگەر هاتوو وەڵامەکان لە ژێرەوە هەبوون، دەتوانی دوو هەڵەکان بەشێوەیەکی جوڵاو ببەیتە دەرەوەو، تەنها وەڵامە ڕاستەکە بهێڵیتەوە.

کاتێك لاپەڕەکە دێتە سەر شاشەکە، ئەگەر بتەوێ هەنگاوەکە بگەڕێنیتەوە، ئەوا بە هۆی دوو سەهمەکە، کە لەلای چەپی کۆمپیوتەرەکە هەن، دەتوانی سوودیان لێ ببینی، یەکێکیان بۆ پێشخستنە و، یەکێکیشیان بۆ گەڕانەوەیە، ئەوەی ناوەڕاستیش بۆ نوسین و هەندێ شتی ترە، کە لە پێشتر باسمان کرد .

وەك ئەم وێنەیە کە چۆن بەشەکان ڕیزکراون .



# چەند بەشێکی گرنگ

سەرەتا بەرنامەی پاوەرپۆینت بکەرەوە، پاشان لاپەڕەیەکی تازە بکەرەوە، دەبینی لەلای راستی کۆمپیوتەرەکە چەند جۆر شێوەی لاپەڕە هەیە، تۆ کلیك لەسور لاپەڕەی تەنیشت لاپەڕە سافەکە بکە، وەك لە وێنەکەدا دیارە.







کلیك لە سەر شێوەکە بکە دەبینی چەند بەشێك زیاد دەبن، لە ناو لاپەڕە تازەکە واتە ئەم بەشانە زیاد دەبن .

١- بەشی یەکەم: ئەم هێمایە ، ئەگەر کلیکی چەپی لەسەر بکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەکرێتەوە، کە لە چەندان وێنە پێك هاتووە، دەتوانین یەکێکیان هەڵبژێرین. ئەگەر کلیك لەسەر بەشی import بکەین، لیستێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە، دەتوانین هەر وێنەیەکی

بمانەوێ بیهێنیت .
٢/ بەشی دووەم: ئەم هێمایە دەبینین وێنەیەکمان بۆ دەکرێتەوە.
٣/بەشی سێیەم : ئەم هێمایە تایبەتە بە دروست کردنی خشتەك، کلیکی چەپی لەسەر بکەی، دەبینی داوات لێ دەکات کە خشتەکەت چەند بەش بێت، دەتوانی جۆری خشتەکە دیاری بکەی .

٤/ بەشی چوارەم : ئەم هێمایە تایبەتە بە هێنانی وێنەی جولاو، کلیکی لەسەر بکە، لیستێکت بۆ دەکرێتەوە، لەو لیستە یەکێکیان هەڵبژێرە، لە دوو بەش پێك هاتوون، یەکێکیان تەنیا دەنگە، ئەوەی تریشیان دەنگ و ڕەنگە، یەکێکیان هەڵبژێرە و دووجار کلیکی چەپی لەسەر بکە، یان کلیکی چەپی لەسەر بکە و پاشان کلیك لەسەر ok بکە، لیستێکی ترمان دێتە پێش، کلیك لەسەر بەشی Automatically بکە، دەبینی ئەگەر دەنگ بێت ئەم هێمایەی دەبێت ، ئەگەر دەنگ و ڕەنگ بێت، ڕەنگەکەی خۆی دەبێت. دوو کلیکی چەپی لەسەر بکە، دەبینی دەنگەکە، یان دەنگ و ڕەنگەکە دەست بەکار دەبێت. دەتوانی دەنگەکە لەگەڵ کۆمەڵە نوسینێك بەکار بهێنی، یان دەنگ و ڕەنگەکە لەگەڵ نوسراو بەکار بهێنی. ئەگەر بتەوێ دەنگەکە بەردەوام دووبارە بێتەوە، واتە لەدوای تەوابوونی دەنگەکە، جارێکیتر دەست پێ بکاتەوە، ئەوا کلیکی ڕاست لەسەر دەنگەکە بکە. پاشان کلیك لەسەر بەشی Edit sound object بکە، لیستێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە، کلیك لەناو چوارگۆشەی بەشی Loop until stopped بکە، ئنجا ok بکە، دەبینی دوای تەواوبونی دەنگەکە جارێکی تر دەست پێ دەکاتەوە .

٥/بەشی پێنجەم : ئەم هێمایە ، ئەگەر کلیکی لەسەر بکەین، شێوەیەکمان بۆ دەکرێتەوە؛ کە پێشتر باسمان کردوە.

٦/ بەشی شەشەم : ئەم هێمایە      ، تایبەتە بە هێنانی هەر وێنەیەك، کە لەناو کۆمپوتەرەکە بێت. کلیکی لەسەر بکە، لیستێکت بۆ دەکرێتەوە، بچۆ سەر ئەو بەشە هاردەی کە وێنەکەی تێدا پارێزراوە، دوو کلیکی چەپ لەسەر وێنەکە بکە؛ دەبینی وێنەکە دێنێتە ناو لاپەڕەکە .



## چۆنیەتی هێنانی نوسین لە بەرنامەی وۆرد

ئەگەر هاتوو نوسینمان لە بەرنامەی وۆرد هەبوو، ویستمان بهێنینە ناو بەرنامەی پاوەرپۆینت، ئەوا ئەم هەنگاوانە دەگرینە بەر :
سەرەتا بەرنامەی word دەکەینەوە، پاشان نوسینەکە دەهێنین، یان نوسینەکە دەنووسین، ئنجا کلیك لەسەر لیستی file دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی send to، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی Microsoft Office PowerPoint و یەك جار کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ دەبینین راستەوخۆ بەرنامەی پاوەرپۆینتمان بۆ دەکاتەوە بە نوسینەکەوە .
هەروەها لە بەرنامەی پاوەرپۆینت بۆ وۆرد بەهەمان شێوەیە.



## چۆنیەتی هێنانی دەنگ بۆ ناو بەرنامەکەمان

ئەگەر بمانەوێت دەنگێك لەناو کۆمپیوتەرەکەمان بهێنین بۆ ناو بەرنامەی پاوەرپۆینت، ئەوا ئەم هەنگاوانە پەیڕەو دەکەین:

سەرەتا بەرنامەکە دەکەینەوە، ئنجا کلیك لەسەر لیستی insert دەکەین، لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی movies and sounds، لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە، کە لە چەند بەشێك پێك هاتووە :

١- Movie from clip organizer تایبەتە بە هێنانی فایلی دەنگ و ڕەنگ بۆ ناو بەرنامەکە. کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ دەبینین لەلای ڕاستی کۆمپیوتەرەکە لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە، یەکێکیان هەڵدەبژێرین و یەك کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە، کلیکی چەپ لەسەر بەشی Automatically دەکەین، ئنجا دوو کلیکی چەپ لەسەر بەشەکە دەکەین؛ دەبینین بەشەکەمان پێشان دەدات، یان ئەگەر لاپەڕەکە بخەینە سەر شاشەکە، ڕاستەخۆ بۆ خۆی دەست پێ دەکات .

٢- movie from file تایبەتە بە هێنانی فایلی دەنگ یان دەنگ و ڕەنگ. سەرەتا کلیکی لەسەر دەکەین، لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە، دەچینە سەر ئەو بەشەهاردەی، کە فایلەکەی تێدا پارێزراوە، دوو کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، ئنجا کلیك لەسەر بەشی Automatically دەکەین، ئەگەر لاپەڕەکە بخەینە سەر شاشەکە، دەبینین ڕاستەوخۆ بەشە دەنگەکە ئیش دەکات .

٣- sound form clip organizer تایبەتە بە فایلی دەنگی. کلیکی لەسەر دەکەین، دەبینین لەلای ڕاستی کۆمپیوتەرەکە لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە، یەکێکیان هەڵدەبژێرین .

٤- sound form file ، کلیکی چەپی لەسەر دەکەین، ئنجا دەچینە سەر ئەو بەشەهاردەی، کە فایلی دەنگی تێدایە، دوو کلیکی چەپی لەسەر دەکەین .
٥- Record sound ئەم بەشەیان تایبەتە بە تۆمارکردنی دەنگ بە هۆی مایکەوە، بەلاّم بۆ ئەم بەشەیان دەبێت ئامێری مایکمان هەبێت. دوای دابینکردنی ئامێری مایك، بۆ تۆمارکردنی دەنگ کلیك لەسەر بەشی stop دەکەین، کە یەکەم بەشە لەلای راست، بۆ وەستانی دەنگەکە، کلیك لەسەر بەشی ناوەراست دەکەین، بۆ دووبارەکردنەوەی، کلیك لەسەر بەشی سێیەم دەکەین، واتە یەکەم لەلای چەپ، دوای ئەوەی دەنگێکمان تۆمار کرد، ئینجا کلیك لەسەر ok دەکەین؛ دەبینین دەنگەکە دێتە ناو لاپەڕەکە، دوو کلیکی چەپی لەسەر دەکەین؛ دەبینین دەنگەکە دووبارە دەکاتەوە، ئەگەر لاپەڕەکە بخرێتە سەر شاشە، دەنگەکە بۆ خۆی دووبارە دەبێتەوە .
بۆ پەشیمان بوونەوەش کلیك لە سەر بەشی cancel دەکەین .



# ناوەرۆك